بسم الله الرحمن الرحيم

ماكان الله ليذر المؤمنين على ما انتم عليه حتى
يميز الخبيث من الطيب ... آل عمران-١٧٩-



# هاوێر

بڵاوكراوەیەكی ئیسلامی یە دەستەیەك لەقوتابیانی زانكۆی صلاح الدین دەری دەكەن

ژمارە (٥) ساڵی یەكەم/ ذي الحجة ١٤١٧ كۆچی – ئایاری ١٩٩٧ زایینی.



قال رسول الله ﷺ

"افترقت اليهود على احدى وسبعين فرقة فواحدة في الجنة وسبعون في النار ، وافترقت النصارى على أثنين وسبعين فرقة ،فاحدى وسبعون في النار ،وواحدة في الجنة ،والذي نفس محمد بيده لتفترقن أمتي على ثلاث وسبعين فرقة، واحدة في الجنة واثنتان وسبعون في النار "قيل يا رسول الله من هم ؟ قال الجماعة ) صحيح سنن ابن ماجة (٣٢٢٦)

قال ابن القيم في اعلام الموقعين :-

اعلم ان الاجماع والحجة والسواد الاعظم هو العالم صاحب الحق وان كان وحده، وان خالفه اهل الارض.

ومنه يعلم بان الجماعة تعرف بالحق الذي هي عليه، وليس بكثرة افرادها وانصارها، فان السنة دلت ان الحق بدأ غريباً وسيعودغريباً كما بدأ والقابض على دينه يومئذ كالقابض على جمر من النار، والغرباء الذين اثنى النبي ﷺ عليهم خيراَ هم " أُناس صالحون قليل في ناس سوءٍ كثير ومن يعصيهم اكثر ممن يطيعهم " *

فدل ان الملاذ والنجاة عند اشتداد االفرقة والاختلاف ، وظهور الاهواء هو بالتمسك بسنة النبي , وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعده.

* اخرجه احمد وغيره، السلسلة الصحيحة.

# سەروتار

لەو کاتەی کە ڕووی زەوی مرۆڤی بەخۆوەگرت، دووبەرەکی نێوان ئیمان وکفر دەستی پێکرد. شەیتان بەخۆی وسەربازەکانی سەنگەریان هەڵکەند بۆ لادانی بڕواداران لەسەر شەقامی خواپەرستی، ئینجا پەیمانیدا کەخەریکی هەڵخەڵەتاندنی موسڵمانان بێت وزەویان بۆ برازێنێتەوە بۆ ئەوەی بیان هێنێتە ڕیزی خۆی لەتۆڵەی ئەوە کەخودا نەفرەتی لێکردوە، ﴿قال ربِ بما أغويتني لأزينن لهم في الارض ولأغوينهم أجمعين﴾ الحجر (٣٩). ئەم دوژمنداریە ودژایەتیە بەدرێژایی تەمەنی زەوی بەردەوام دەبێت بەشێوەك نەئاشتی، نە صولح، نەئاگر بەست، نەمفاوەزات،...) چارەسەری ناکات، جا شك لەوەدانیە کە شیطان نەسەنگەر چۆڵ دەکات ونەدەستە وەستان دەبێت، سەرنجام مرۆڤایەتی بوون بەدوو کۆمەڵ، کۆمەڵی خوا وکۆمەڵی شیطان بوون بەدوو دروشم، دورشمی ڕەوا (الحق) ودروشمی نارەوا (الباطل)، بوون بە دوو کۆمەڵگە کۆمەڵگەی ئیسلامی وکۆمەڵگەی جاهیلی. جابەشێوەیەك بوون بەدوو دەستە کەمرۆڤی بێ لایەنی تێدا نەما، یان دەبێت لەریزی حزبی خودا بمێنێتەوە یان هەڵبخەڵەتێ وبچێتە سەر حزبی شیطان، دوو کۆمەڵی جیاوازن تێکەڵ نابن لە یەکتر ناتوێنەوە وخاڵی هاوبەشیان تێدا ڕەچاوناکرێت نە (خزمایەتیو دۆستایەتی، ونەخاك وولات ونە نەتەوە گەریی وعەشیرەتگەری ونەزمان ورەنگ ...).

﴿لاتجدُ قوما يؤمنون بالله واليوم الاخر يوادون من حاد الله ورسوله ولو كانوا ءاباءَهم او أبناءهم أو إخوانهم او عشيرتهُم اولئك كتب في قلوبهم الايمانَ وأيدهم بروحٍ منهُ ويُدخلهُم جناتٍ تجرى من تحتها الانهارُ خالدين فيها رضى الله عنهم ورضوا عنه اولئك حزبُ الله ألآ إن حزب اللهِ هُمُ المفلحون﴾ المجادلة (٢٢).

ئەوەی جێی سەرنجە کە هەموو گێرو گرفتێك جا چ (سیاسی، ئابوری، بازرگانی، کۆمەڵایەتی، زانستی، نەتەوەیی، ...) بێت سەرنجام چارەی هەموو وکێشەکە بن بڕ کراوە، بەڵام کێشەی باوەڕ وبێ باوەڕی چارەی نیە، چونکە کێشەکە کێشەی بیرو باوەڕە (العقيدة).

جا سەنگەر گرانی شیطان زۆر بەدڵسۆزیەوە هەوڵ دەدەن بۆ سەرخستنی ڕێبازەکەیان چونکە شیطان وکۆمەڵگەی شارەزایان هەیە لە سروشتی ئەم ئیسلامە. هەر بۆیە شیطان کاتێك ڕایگەیاند کەشەڕ لەگەڵ مرۆڤ دەست پێدەکات، گوتی تەنها ئەوەی خواویست بێت ناتوانم هەڵی بخەڵەتێنم ﴿الا عبادك منهم المخلصين﴾ الحجر (٤٠). دەزانن مەرامی کۆمەڵی خوا تەنها پەرستنی خودایە لەسەر زەوی ووازهێنانە لەهەموو طاغوتێك، تێك وپێك شکاندنی هەموو بەربەستێکە کەبێتە سەر ڕێگایان، کۆمەڵی شیطانیش زۆر داخ لەدڵن بۆ هاڕین وتێك وپێك شکاندنی بەرنامەی بڕواداران، چونکە تەنها ئیمانە هەڕەشە لە لەناوچونی خۆیان وبەرنامەکەیان دەکات، بەدرێژای ژیانی پێغەمبەران ﷺ ئەم دوژمنایەتیە بەرچاو دەکەوێت، بەردەوامیش دەبێت تا رۆژی دوایی، هەر بۆیە بەسەرهاتی ئادەم (عليه الصلاة والسلام) چەند جار دوبارەکراوەتەوە لەقورئان، تاوەکو ئیمان داران سەنگەری خۆیان بزرنەکەن ﴿يا ايها الذين آمنوا ادخلوا في السلم كافة ولا تتبعوا خطوات الشيطان إنهُ لكم عدّ مبين﴾ البقرة (٢٠٨).

کاتێك کە ڕابەرو پێشڕەومان محمد ﷺ هاتە سەر دونیا زۆر بەوردی سەیری کێشەی ئیمان وکفری دەکرد، بەجۆرێك بەهیچ شێوەیەك نەی دەهێشت نزیك بوونەوەی تێدا ڕوبدات، کاتێك سەرکردەکانی قورەیش لێی نزیك بوونەوە هەموو شتێکیان خستە ژێر دەستی (ماڵ، سامان، دەستەلات...) بۆئەوەی ڕازی بێت، بەڵام ڕازی نەبوو، تالەئەنجامدا گوتیان ئێمە ساڵێك خوای تۆ دەپەرستین تۆش ساڵێك خوای ئێمە بپەرستە، بەڵام ڕازی نەبوو، گوتیان مانگێك ڕازی نەبوو، ئنجا خودای گەورە کۆتایی بەم کێشەیە هێنا وفەرمووی ﴿قل ياايها الكافرون لااعبد ماتعبدون، ولاانتم عابدون مااعبد، ولا انا عابد ما عبدتم، ولا انتم عابدون ما اعبد، لكم دينكم ولي دين﴾ الكافرون.کۆمەڵی شیطان هەرگیز بەڵێن و پەیمانیان نیە ونایگەیەننە سەر چونکە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿كيف وإن يظهروا عليكم

لا يرقبوا فيكم الا ولا ذمة﴾ التوبة (٨). بەڵێ هەرکاتێك کوفر بێ هێز ودەست کورت بێت بەڵێنیان دەپارێزن، بەڵام هەرکە هێزو گوڕیان هاتەوە بەر وەك گورگی برسی پەلاماری موسڵمانان دەدەن، هەرچی بەڵێن وپەیمان هەیە هەڵیدەوەشێننەوە ئەگەر چاوێك بەمێژووی ئیسلام بخشێنین ئەم ڕاستیانە زیاتر خۆیان دیار دەخەن.
سەیری هێرشی تەتەرەکان بکە بۆ سەر بەغدا لەساڵی ٦٥٦هـ کەلەسێ ڕوایەتی جیاواز باسی دەکات[1] لەیەکێکیان دەڵێ (٨٠٠،٠٠٠) لەیەکێکی تر یەك میلون وە لەئەوەی تریان دەڵێ دوو میلون موسڵمان شەهیدکران. کاتی جیابوونەوەی پاکستان لەهندستان پێنج ملیون موسڵمانی هیندی شەهیدکران بەدەستی هیندە گا پەرستەکان، لەصین وروسیا کاتێك کەخوانەناسان بالادەست بوون لەماوەی ٢٥ ساڵدا (٢٦) ملیون موسڵمانیان لەناوبرد، ئەم کارەساتانە بەردەوامن هەرکاتێك هێزیان هەبێت، جا ئەم هێزە لەدەست کوفری ئینگلیزی وفەرەنسی وروسی وعەرەبی وکوردی و...) دابێت هیچ جیاوازیان لەنێوان دا نیە چونکە کوفر هەر کوفرە جالە هەرکۆمەڵێك بێت.
زۆر سەیرە موسڵمانیش بەو سادەییەوە دەیانەوێ حوکمی خوا بهێننەوە، بەپەرلەمان، بەوەزارەت، بەپەیمان پێدان،...) لەڕاستیدا ئەم دام ودەزگایانە لەفێڵ وپیلانێکی کوفری جیهانی بەترازێ هیچی تر نیە، وەك لەجەزائیر ئەم ڕاستیە بینرا. بەسەدان ساڵە کوفر خەبات دەکات بۆ دامەزراندنی دەولەتی بێباوەڕی، چۆن ڕێگا بەموسڵمانان دەدەن بەهەڵبژاردن بێنە سەرحوکم قورئان بکەنەپەیڕەو؟ مەگەر موسڵمانان ئەم ڕاستیە نازانن؟ ئەوە مەتەڵێکەو داهاتوو ئەم ڕاستیەمان بۆ یەك لا دەکاتەوە.



[1] لەکتابی (البدایة والنهایة)/ ابن کثیر مجلدی (١٣).

بەشی دووەم

## ئیسلام چۆن چارەسەی تاوان (الجریمة) دەکات؟

وەرگێرانی: عومەر بابەکر

ب/ ئەو تاوانانەی کەپەیوەندیان بە (نفس)ەوە هەیە:-

١- کوشتن: مەبەست لەکوشتنی مرۆڤی بێ تاوانە، ئەو کوشتنەش یان بەنیازەوە (واتە: عمد العدوان) ئەنجام دەدرێ یان بەهەڵە (واتە: قتل الخطاء).

• ئەو کەسەی بەنیازەوە -عمداً- یەکێ بکوژێ، دەبێت سزا بدرێت، سزاکەشی بریتیە لەکوشتنی نەك تەنها بەندکردنی، بەپێی بنچینەی (الجزاءُ من جنس العمل). ئەگەر دادوەرانە بیرکەینەوە ئەم سزایە سەخت نیە - هەروەك دوژمنانی ئیسلام پروپاگەندە دەکەن -چونکە تاوانبار هەڵساوە بەلەناوبردنی گیانی بەندەیەك، هەڵساوە بەکوشتنی ئەندامی خێزانێك و کۆمەڵگایەك.

ئەگەر بزانرێ کەسزای پیاوکوژ، (کوشتن)ە، ئەوا ڕاددەی ئەنجام دانی ئەو کارە کەم دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر سزای کوشتنی مرۆڤی تەنها چوونە بەندیخانە بێ ئەوا بێگومان پیاو کوژ ئەنجام دانی ئەو کارەی لەلا ئاسانتر دەبێت، واتە ترسی کەم تر دەبێت.

هەروەها بەندکردنی تاوانبار زیانێکی تریشی لێ پەیدا دەبێ کەئەویش ئەوەیە: لەوانەیە کەسێ تەنها یەك جۆرە _جریمە)ی زانیبێ وئەنجامی دابێ بەڵام کاتێ دەخرێتە بەندیخانە بەهۆی تێکەڵ بوونی لەگەڵ بەندکراوەکانی تر فێری ئەنجام دانی چەندین تاوانی تریش دەبێت.

• بەڵام ئەو کەسەی بەهەڵەو بێنیاز ڕووداوی کوشتنی لەدەست دەردەچێ ئەواسزاکەی جیاوازە، تەنها (الدّیة)ی لەسەرە، واتە دەبێ پارە یان شتێکی تری گران بەها لەجێگای ئەو بەخێزانەکەی ببەخشێ، کەبێ گومان خێزانی کوژراوە کەئەو

(الديــه) ديار دەكـەن. وە شـەرع ڕێی بـەخێزانی پیـاوە کوژراوەکـە داوە، کەلـەتاوانبار ببـورن ولێی خۆشـبن، وەبەراسـتی ئەمـەیان زۆر گونجـاوە بـۆ چـەرخێکی وەك ئـەمڕۆ کەبـەهۆی پێشـکەوتنی پیشەسـازی -بەتایبـەتی دروسـت کردنـی ئۆتۆمۆبیل- ئەم جۆرە ڕووداوە زۆر بووە.
٢- شوێندانی جسم وبڕینی ئەندام ولەکەڵکخستنی چەند پارچەیەکی لاشەی مرۆڤ:- سزای ئەو جۆرە تاوانە مامەڵەی (بالمِثل)ە، واتە: ئەوەی چاوێ کوێر بکات کوێر دەکرێتـەوە ..... بەڵام ئەگەر شوێنێکی بریندار کرد کەنەدەتوانرا (حَـد)ی لێ دەرکرێت ئـەوا دەبـێ (الدّیـە) بـدات ئەمـەش ئایـەتی پـیرۆزی ﴿والعينَ بـالعينَ والأنـفَ بـالأنفِ والأذنَ بـالأذنِ والسِّنَ بِالسِّنَ وَ الجـروحَ قِصـاص﴾ المائدة (٤٥). ڕوونی دەکاتەوە. بەڵام ئەو تاوانە ئەگەر بەنیازەوە نەکرابێ وابەچاك دەزانرێ کەخاوەن زیان لـەتاوانبار ببوورن.
ج- ئـەو تاوانانـەی کەپـەیوەندی یان بـە (ئـەقڵ)ەوە هەیە:-
١- بێ هۆش بوون (الإسكار): سزای بـێ هـۆش بـوون (جَلـد)ە لێدانـە، جـا ئـەو بێهـۆش بوونـە چ بـەهۆی خواردنــەوەی ئارەقــەوە بێـت چ بــەهۆی (مُخدِّرات)ەوە، وە ئـەو کەسـەی بەعیلمەوە ماددەی بێ هۆش کـەر دروست بکـات یـان بچێنێـت ئـەوا سزاکەی (کوشـتن)ە چونکـە ئەمـەیان زیـان بـەتاك وکۆمەڵی موسڵمانان دەگەیەنێ.
٢- لـەهۆش بردنـی کەسـێ بـەهۆی دەرمـان، یـان بەهۆی لێدان لەسەری بەنیازی بێ هۆش کردنی:- شەریعەتی ئیسلام سزای گونجاوی بۆ ئەو تاوانەش دانـاوە، کەلەوانەیـە هـەندێ جـار بگاتــە بڕیـاری کوشتنی تاوانبار.
د- ئەو تاوانانەی پەیوەندییان بەدراوو وسامانەوە هەیە:-
١- دزی کـــردن: هەرکەســـێ ســـامان ودراوی کەسێکی ترببات بەنهێنییەوە ئـەوا سزاکەی بڕینـی دەستییەتی لە مەچەکەوە (الرسغ)ەوە، سـەبارەت بـەم سـزایەش چـەندەها گومـان دروسـت کـراوە، پێشنەوەی وەڵامی ئـەو گومانانـە بدەینـەوە باسـی جۆرەکانی (دەست) دەکەین لەئیسلام:-

* دەستێ کەخاوەنەکەی خزمـەتگوزار بـووە بـەڵام بەهۆی پیری یان پەککەوتەیی ئێستابێ کارە، ئەم دەستەڕێزی لێ دەگیرێ.
** دەستێ کەخاوەنەکەی کارکەرو داهێنـەرە، ئـەم دەستەش بەرێزەو گرانبەهایە.
*** دەستێ کەخاوەنەکەی نەزانـە، ئەمەشـیان فێرەدەکرێ تابێتە دەستێکی سوودبەخش.
**** دەستێ کەخاوەنەکەی زۆردارە، ئەم دەستە دەبێ ببڕێ وفڕێبدرێ.
وەدەبێ ئـەوەش بزانین کەلەچەند حاڵەتێك بڕیاری (دەست بڕین) هەڵدەگیرێت، بۆنموونە:-
- ئەگەر کوڕ سامانی باوکی برد یان پێچەوانەکەی، وەئەگـەر ئـافرەت سـامانی مێردەکـەی بـرد یـان پێچەوانەکەی، لەم حاڵەتە دەست بڕیـن جێبەجێ ناکرێ.
- ئەگەر کەسێ بەهۆی هەژارییەوە کتێبی عیلمی دزی بۆ خوێندن وسوود لێوەرگرتنی، ئـەو کەسـە سزای دەست بڕینی جێبەجێ ناکرێ.
- ئەگەر کەسـێ بـەهۆی هـەژاری، بۆپـەیداکردنی خواردن وپێداویستی خێزانی دزی کـرد، ئـەویش سزای دەست بڕینی لەسەر جێبەجێ ناکرێ.
- وە لەبارو دۆخی گرانی ونەهاتی وبێ کاری ئەم حوکمە هـەڵدەگیرێت، عومـەری کـوڕی خـەتتابیش (رضي الله عنه) لەساڵی برسێتی (عـام المجاعـة) ئەم کارەی کرد.
- وە بوونـی (گومـان) دەبێتـە هـۆی هـەڵگرتنی حوکمی دەست بڕین.
جـا ئێسـتا ڕوودەکەینـە ئـەو کەسـانەی کەسـزای دەست بڕین بەتوند دەزانن، وپێیان دەڵێین:-
لـەپاش ئـەوەی دەوڵـەتی ئیسـلامی کـار بۆخـەڵك دەدۆزێتـەوە وژیـان وگوزەرانیـان گونجـاو دەکـات، کەسـێکی زۆردار قـۆڵی مەردایـەتی بـۆ کـارکردن هەڵنـەماڵێ، بـەڵکو پیشـەی بڕیتـی بـێ لـەبردن ودزینی بەرهەم ورەنجی خەڵکانی ماندوو شەکەت، جا ئایا کەدەوڵەت هەڵسێ بەسزادانی ئەو کەسـانەی بـەبڕینی دەسـتی دەبـێ کـارێکی هەڵـەو نـارەوای ئەنجام دابێ. ؟! دەبێ ستەمی لێ کردبێ؟!
٢- تـالان (الأنتهـاب):- مەبەسـت لەمـە دەسـت بەسـەردا گرتـن وتـالان کردنـی شـوێنێکە لەلایـەن

چەند کەسێکەوە. بێ ئەوەی هیچ کەسێ بەرنگاری ئەو کارەیان بووبێتەوە. ئەو جۆرەکەسانە ئاژاوە چی وتێکدەرن وفەسادی لەسەر زەوی ئەنجام دەدەن، بۆیە سزای توند وتیژیان بۆ دانراوە، ئەو سزایەش لەدەوری _کوشتن ولەخاچ دانی ((صلب)) ودەست وقاچ برین ولەوولات بەدەرنان) دەخولێتەوە، بەگوێرەی چۆنێتی وچەندێتی تاوانەکە. خوای گەورە لەقورئانی پیرۆز دەفەرمووێ: ﴿ ... وَ يَسعونَ في الارضِ فساداً أن يُقتلوا أو يُصلبوا أو تُقطَعَ أيديهُم وَ أرجُلَهُم مِن خِلٰفٍ أو يُنفَوا مِنَ الأرض..﴾ المائدة (٣٣).

٣- ڕیبا کردن:- (ریبا) دوو جۆرە:- أ- ریبای بۆ زیادە (ربا الفضل):- واتە کرداری گۆڕینەوەی دراوێ لەرەگەز (جنس)ێ لەگەڵ دراوێکی تری هەمان رەگەز، بەڵام بەجیاوازی زیادەیەك.

بەبەڵگەی ئەو فەرموودە پیرۆزەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:- (لا تبيعوا الذهب بالذهبِ إلا سواءً، ولا الفضة بالفضةِ إلا سواءً بسواء، وبيعوا الذهب بالفضة، والفضة بالذهب كيفَ شئتم) رواه البخاري.

ب- ریبای نەسیئە:- واتە کرداری قەرز کردنی پارە لەیەکێ بەو مەرجەی لەکاتی دانەوەی قەرزەکەی زیادەی بێتە سەر. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (كلُّ قرضٍ جرَّ نفعاً فهوَ رِبا).

ئەوەی راستی بێ (ریبا) لەترسناکترین ئەو مامەڵانە دادەنرێ کەدەبنە هۆی تێکدانی ئابوری وڵات، خوای گەورەش جاری جەنگی داوە لەگەڵ ئەوکەسانەی کەواز لە ریبا کردن ناهێنن، بۆیە فەرمانڕەوا بۆی هەیە سزای بەقەد گەورەی ئەو تاوانە دابنێت بۆ ئەو کەسانەی کەدەست بەرداری ئەو کردارە پیسە نابن.

٤- غەشکردن:- ئەم تاوانەش جۆری زۆرە، وە ترسناکەو زیانی نهێنی وبەرچاوی هەیە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێ: (مَن غشّنا فليس منا). رواه مسلم. وەسزای توندوتیژی وەك خاڵەکانی پێشوو بۆ ئەنجامدەرانی ئەو تاوانەش دانراوە.

٥- فێڵ کردن لەتەرازوو:- لەبەر گەورەیی ئەو تاوانە خوای گەورە نەتەوەی (شُعیب) پێغەمبەری لەناوبرد ﷺ هەروەها هەرەشەی ئایەتی ﴿ويلٌ للمطففين﴾ المطففين (١) لەکەس شاراوە نیە. بۆ ئەم تاوانەش سزای توندی لەوێنەی سزاکانی پێشوو داناوە.

٦- خواردنی ماڵی خەڵك بەناهەق:- ئەم ستەمەش جۆری زۆرە وترسناکی ئاشکرایە، بۆیە سزای پێویستی بۆ دارنراوە -لەشێوەی ئەوانی پێشوو- بەپێی گەورەیی وبچووکی تاوانەکە دەگۆڕێ.

٧- (الأبتزاز): ئەوەش سوود وەرگرتنە لەبارێکی نائاسایی بۆ پاڵە پەستۆ خستنە سەر کەسێ بەو نیازەی پارەی لێ وەربگرن بەشێوەیەکی ناڕەوا، وەك فراندنی منداڵی پیاوێکی زەنگین بۆ ئەوەی بەرامبەر بەپارەیەکی زۆر ئینجا بیدەنەوە، وە هەر کردارێکی تری لەو بابەتە، بێ گومان لەبەر نارەوایی ئەو تاوانە ئیسلام سزای قورسی - لەشێوەی ئەوانی پێشوو- لەسەر ئەنجام دەرانی جێبەجێ دەکا.

سێیەم:- ئەو تاوانانەی کە دژ بەدەوڵەتی ئیسلامی ئەنجام دەدرێن:-

ئەمەشیان چەند جۆرە تاوانێ دەگرێتەوە، لەوێنەی:-

أ- جاسوسی کردن ب- شت بردنە دەرەوە (تهریب) ج- تەزویر کردنی دراو د- تەزویر کردنی بەڵگەنامەی رەسمی هـ- ناپاکی کردن (الخيانة) بێگومان ئەو تاوانانەش ترسناك وزیان بەخشن، باری رامیاری دەوڵەت دەشێوێنێت وئابوورییەکەی بەرەو هەڵدێر دەبەن، وئارامی وئاسایش لەخەڵك هەڵدەگرن. کەواتە ئەو کەسانەی بەو جۆرە تاوانە هەڵدەستن حیسابی فەساد کردنی زەوی یان بۆ دەکرێت، بێ گومان سزای ئەمەش زۆر توندە ووەك باسمان کرد لەدەوری _کوشتن ولەخاچ دان (الصلب)و دەست وقاچ برین ولەوڵات بەدەرنان) دەخولێتەوە بەپێ چەندێتی وچۆنێتی وگەورەیی وبچووکی تاوانەکە.

پوزش :- داوای لێبووردن لە گشت خوێنەران دەکەین لەبەر ئەوەی لەبەشی یەکەمی بابەتی(ئایا ئیسلام چۆن چارەسەری تاوان دەکات ) لەجیاتی ئەوەی بنووسرێ (وەرگێڕانی عمر بابەکر )بە هەڵە نووسرابوو (نووسینی: عمر بابەکر)



❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖

# جاهلیەتی رۆژئاوا

نوسینی: جوامێر أحمد محمد
کۆلێژی: پەروەردە

پێش ئەوەی دەست نیشانی جاهلیەتی رۆژئاوا بکەین، پێویستە ئاورێك بدەینەوە لەووشەی جاهلیەت (الجاهلیة) لەروانگە وتەرازوی قورئان وسوننەت، چونکە لەفەرهەنگی بیر وتێروانینی فەلسەفەکاندا تەفسیر ولێکدانەوەی جیاجیای بۆکراوە، وەلە شوێنی خۆی بەکارنەهاتووە واتە (تحریف) کراوە، لەم لێکدانانەوەشدا گوایە ووشەی جاهلیەت تایبەتە بەکات وشوێنێکی دیاری کراو، واتە تەنها بەستراوە بەدورگەی عەرەبی پێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، یان جاهلیەت بریتیە لەچاولێکردنی کۆمەڵگاکانی پێش خۆمان جا لە بارەی (داب ونەریتی کۆمەڵایەتی بێت، یان بیروباوەڕەو، یان ...).

لەراستیدا ووشەی جاهلیەت یەکێکە لەو ووشانەی کەتایبەتە بەئیسلام،جا تەنها لە ئیسلام لێکدانەوەی ئەم ووشەیە هەڵدەهێنجرێت، چونکە پێشی ئیسلام کەسی تر بەم واتایە بەکاری نەهێناوە، ئەو کەسانەی کەبەهەواو هەوەستی خۆیان لێکیان داوەتەوە تەنها گومرایی وسەرلێ شێواوی یان بۆ ماوەتەوە.

وشەی (جاهلیەت)لە زمانەوانیدا وەك ئیبن وتیمیە دەفەرمووێ (هو عدم العلم او عدم اتباع العلم) واتە بریتیە لەنەبوونی زانست وملکەچ نەکردن بۆ ئەم زانستە، بەڵام لەرووی زاراوەدا (الشرع) بریتیە لەوە خودای گەورە بەتاك وتەنها نەناسێت، یان مل کەچ نەبێت بۆ شوێن کەوتنی بانگی خودا لەسەر زەوی، بابەیەکەوە بروانینە پەرمکانی قورئان خودا لەبارەی میللەتی موسی (علیه السلام) دەفەرمووێ ﴿وجاوزنا ببَني اسرائیل البَحر فأتوا على قوم یعكِفون على اصنام لهم، قالوا یاموسى اجعل لنا الهاً كما لهم آلهة قال انكم قوم تجهلون﴾ الاعراف (١٣٨). لێرەدا ووشەی (تجهلون) بەمەبەستی جیانەکردنەوەی خودای تاك وتەنیایە.

یان دەفەرمووێ ﴿ولاتبرجن تبرج الجاهلیة الاولىٰ﴾ الاحزاب (٣٣). لێرەش دا مەبەست لە (الجاهلیة) واتە مل کەچ نەکردنە بۆ جێبەجێ کردنی داواکاریەکانی خوا. ئەم دیاردەیە بەجاهیلی دانراوە کاتێك ئافرەت جوانی خۆی دیاردەخات کەچی رێی پێنەدراوە، یان دەفەرمووێ ﴿افحكم الجاهلية يبغون، ومن احسن من الله حكما لقوم يوقنون﴾ المائدة (٥٠). لێرەش دا ئەم بەرنامە دەست کردە مرۆیانەیی‌یەبە (جاهلیة) داناوە کاتێك کەمرۆڤ وەك بەرنامەیەکی ژیانی بەکاری دەهێنێت.

لەژێر سێبەری ئەم ئایاتەنە تێگەیشتین کەجاهلیەت واتە (نێ نەگەیشتن لەراستی پەروەردگارێتی خودا، یان گوێڕایەڵی نەکردن وملکەچ نەبوون بۆ داواکاریەکانی خودای کاربەجێ) ئەمەش بەڵگەی ئەم کەسانە پوچەڵ دەکاتەوە کەدەڵێن جاهلیەت بەستراوە بەکات وشوێنێکی دیاری کراو.

لەراستیدا هیچ بەڵگە یەکیان بەدەستەوە نیە تەنها ئەوە نەبێت کەخودا باسی کردوون، دەفەرمووێ ﴿أفرأيت من اتخذ الهه هواه﴾ الجاثية (٢٢).

جا ئەگەر روبکینەوە جاهلیەتی، (رۆژئاوا) هەرچەندە وولاتە بەناو ئیسلامیەکان بێ بەش نین لەم جاهلیەتە یان لەزۆربەی خاڵەکان یەکتر دەگرنەوە بۆ پێك هێنانی بەرمیەکی جاهیلی،رۆژئاوا بەوەجیادەکرێتەوە کەهێزو دەستەڵاتێکی ماددی یەکجار گەورەی لەژێر دەستدایە توانیویەتی زەوی ئاوەدان بکاتەوە بەو زانست وپێشکەوتنەی کە خۆی بەبەدیهێنەری دەزانێ وشانازی پێ دەکات، واش دەزانێ کەئەم دەستکەوتە تەنها ئەو بەدەستی هێناوە بەدرێژایی مێژوو، سەرچاوەی ئەم پێشکەوتنە جارێکیان لە شارستانیەتی مسیحیەت. (الحضارة المسیحیة) دەزانێ وجارێکیان لەشارستانیەتی یونانیە کۆنەکان یان رۆمەکان دەزانێ ... . بە هەرشێوەیەك بێت بەرهەڵستی ئەوە دەکات کەئیسلام کەم وزۆر نەیتوانیوە دەورێك بگێرێت بۆ ئەم پێش کەوتنە. پێشە ئەوەی ئەم

گومانەیان رەت بکینەوە بابیبینەوە سەر ئەوە ئایا پێشکەوتنی ماددی وتکنلۆجی وهێز ودەستەلات دەبنە بەڵگەیەك کەلە جاهلیەت رزگاریان بکات.

بابگەرێینەوە بۆ تێروانینی قورئان بزانین بەسەرهاتی میلەتان چۆن بووە، خودا دەفەرمووێ ﴿او لم يسيروا في الارض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم كانوا اشد منهم قوة وأثاروا الارض وعمروها اكثر مما عمروها، وجاءتهم رسلهم بالبينات فما كان الله ليظلمهم ولكن كانوا أنفسهم يظلمون﴾ الروم (٩). واتە ئەی ئێوە بۆ لەسەر ئەم خاکە ناروانئە بەسەرهاتی کۆمەڵانی پێش خۆتان. خۆ زۆر لە ئێوە بەهێزتر بوون، بالادەست بوون لەسەر زەوی توانویانە پێش بکەون وئاوەدانی بکەنەوە لەئێوە باشتر. بەلام کاتێك پێغەمبەرمان بۆ رەوان کردن بەوبەڵگە دیارانە، بەلام ئێوە لەروویانەوە راوەستان ئەمەش بوو بەهۆی وێران بوون تەنها خۆتان تاوانتان لەخۆتان کرد خودا تاوانی لێ نەکردن.

زانیمان ئەم زاراوەیە (الجاهلیة) نەبەستراوەبەهێزو دەستەلات یان بە پێش کەوتی ماددی وتکنلۆجی یان زانست دەربارەی دیاردەکانی ژیانی دونیا.

پێغەمبەر ﷺ شایەدی داوە بەجاهلیەتی عەرەب لەپێش خۆیدا ئەگەر چی عەرەبەکان زۆر رێزیان لەمرۆڤ دەگرت. ئەگەر پیاوێکی نەناسراو بهاتبا بۆ مکە لەوێدا زوڵمیان لێ بکردایە، خەڵکی مەکە کۆدەبوونە وە بۆ ئەوەی حەقی بسەنەوە، رێزی میوانیان لا زۆر گەورە بوو، بەدەنگی هەژار وماف خورا وچەوساوان دەهاتن، لەمانە سەیر تر بروایان بەپەروەردگاریەتی خودا هەبوو.... هەموو ئەم کردەوانەی عەرەبەکان نەبوون بەرێگرێك کەنەکەونە ناو کۆمەڵی جاهلیی، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (خیارکم في الجاهلية خیارکم في الاسلام اذا فقهوا) رواه مسلم. واتە باشترینتان لەجاهلیەت باشترنتان دەبێت لەئیسلام بەمەرجێك لەئیسلام شارەزابن،

بابگەرێینەوە بۆ گومانی یەکەم رۆژئاوا وادەزانێ ئەم هێزو دەستەلاتە تەنها خۆی یان لەشارستانیەتی مەسیحی یان یونانیە کۆنەکان یان رۆمەکان بۆی جێماوە، بروانە زمانی بریفولت لەپەرتوکی (بناء الإنسان) کەناتوانێت ئەم راستیانە بشارێتەوە وەدەڵێت (لم يكن العلم وحده هو الذي اعلا أورباالى الحياة، بل ان مؤثرات اخرى كثيرة من مؤثرات الحضارة الاسلامية عثت باكوره اشعتها الى الحياة الأوربية) خۆیان گومانیان نیە لەوە کاتێك رۆژئاوا گەنجەکانی خۆی دەنارده قوتابخانە ئیسلامیەکان بۆ ئەوەی زانست فێر ببێت لە اندلس وسەرووی افریقیا و..)، بەردەوامیش نوسراوە ئیسلامیەکانیان بۆ سەر زوبانی خۆیان وەردەگێرا، رۆژئاوا بەگشتی بەدوو شێوە توانی سود لەپێشکەوتنی ئیسلام وەربگرێت، یەکەمیان بەشێوەی ئاشتی وەك ئەندلس وسەرووی ئەفریقیا، دووەمیان بەشێوەی شەڕ وداگیر کردن وەك لەشەرەکانی خاچ پەرست (الحروب الصليبية) بەلام ئەم مغرووریە وخۆ بەزل زانینەی رۆژئاوا تەنها ویستویەتی راستیەکان بشارێتەوە وملی بۆ کەچ نەکات، زۆر بەفیز ودلشادە کەخۆی دەبینێت، خوای کار لەجێش دەفەرمووێ ﴿فلمّا جاءتهم رسلهم بالبينات فرحوا بما عندهم من العلم، وحاق بهم ماكانوا به يستهزئون﴾ غافر(٨٣). بەلام خودای گەورە بەپێچەوانەی هەوا وهەوەستی وان ئەمجارەیان خەریکە لەرۆژئاواوە پەردە لەسەر جاهیلیەت هەڵدەدرێتەوە وئەو تەم ومژانە لەگەڵ خۆیدا لادەدات.

ئەگەر روو بکەینە چۆنیەتی خواپەرستی رۆژئاوا دیارە لەوکاتەی ئایینی کلێسە گوردرا توانی بەتەواوی باڵی بەسەر رۆژئاوا بکێشێت، بیروباوەری فلسفە کۆنەکانی یونانیەکان ورۆمانیەکان وشك بکاتەوە لەبیرو هۆشی مرۆڤی رۆژئاوایی تا گەیاندیە سەرەمەگ وبەجارێك رۆژئاوا کەوتە ژێر تەم ومژی جاهیلیەتی کلێسە کلێسەش بەهەوا وهەوەستی دەستەلات دارەکان لێ کەم وزیاد دەکرا، تاوای لێ هات توشی شرك بوون.. بەجارێك رۆژئاوا توشی شرك بوو، لەجیاتی خودا بەتاك وتەنیا بزانن، سێ خودا یان لەجیاتی بریاردا ناویان نا (التثليث).

لەسەر ئەم دینە گۆڕدراوە وئەم بیروباوەڕە شرکیە دامەزرا لەهەمان کاتدا بیروباوەڕیـان جیـاکردەوە لەشریعەتوپڕۆگرامـی ژیانیـان بەشـێوەیەك هیـچ دەوڕێکـی لەسـەر شـانۆی ژیانیـان واقعـی نـەبوو، بـەڵکو ئـەوەی هێشـتیانەوە تـەنها بیروبـاوەڕێکی گۆڕدراو (مُحَرَّف) بوو لە گۆشەی کلێسەکان.

لە ئەنجامی ئەم دەست تێ وەردانە کەبەسەر دینی ڕۆژئاوا هـات، بوە هـۆی مل ملانێ کردنی کلیسـە وژیـانی واقیـع چونکـە کلێسـە بـەهیچ شـێوەیەك نەیدەتوانی پارسەنگێك دروست بکات لەنێوان ئەم دینـە گـۆڕدراوە وئـەم واقیعانـەی کەدەهاتنـە پێـش لەسـەروی هەموویانـەوە پێشـکەوتنی مـاددی وتکنلوجی.

کەکلیسەکان حاشای دەکرد لەهەر کەسێك دەهـۆڵ بۆ ئەم پێشکەوتنە لێ بدات.

لەئەنجامدا هەڵگرانی دروشمی پێشکەوتن بەجارێك حاشایان لەهەموو دینێك کردوو لەبەر ئەم کردەوەی کلێسە، ئەم پێشکەوتنەش هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێش دەچوو، تاوای لێ هات ڕۆژئاوا زۆر پێشکەوت لەلایـەنی مـاددی وتکنلوجـی بـەڵام بـەبێ دیـن وبەرنامەی ژیان مایەوە، ڕۆژئاوا توانی خۆی ڕزگار بکـات لەجاهلیـەتی کلێسـە بـەڵام نـەیتوانی ڕزگـار وئارام بێت چونکە ئـەوەی ڕۆژئـاوا دەسـتی پێـوە گرت ئـەویش هیـچ کـەم تـر نـەبوو لەجاهلیەتەکـەی کلێسـە لەئـەنجامدا لـەجیاتی سـارێژ کردنـی برینەکانی ڕۆژئاوا لەلایەن کلێسەوە. برینەکانی زۆر لەجاران قوڵتربوو، جا ڕۆژئاوا کەوتـە نـاو گێـژاوی گەردەڵولەیەك بەتەواوی وەڵامی ئەم پرسیارانەی لێ تێك چوو کەخولیا وشەیدای زانینیان بوو، ئەویش ئایـا مـرۆڤ بۆچـی دروسـت کـراوە؟ بـەرەو کـوێ دەچێـت؟ لەئـەنجامدا بـۆ وەڵام دانـەوەی ئـەم پرسیارانە دروشمێکیـان بەرزکردەوە ودەیان گـوت (﴿إن هي الا حياتنا الدنيا نموت ونحيا ومانحن بمبعوثين﴾، بـەهیچ شـێوەیەك ڕۆژئـاوا نـەیتوانی پارسەنگێك دابنێ بۆ هەریەك لەئاین ودەسـتە لات ورەوشـت وپێشـکەوتن و...) بیـان خاتـە شـوێنی خۆی هیچیـان بەسـەر ئـەوەی تریـان دا زاڵ نەبێـ، وەك ئێستا دەبینیـن ئـاینێکی بـێ گیـان ودەسـتە لاتێکی بـێ ویژدانـە ورەوشـتێکی ئـاژەڵی ودور لـەئاین وخواپەرسـتی، بەهـەر حـاڵێك ئـەم پێشـکەوتنەی کـە ڕۆژئـاوا چاندوویـەتی وخـۆی بـەخاوەنی دەزانـێ ئێسـتا خۆیـان ومرۆڤایـەتی بەگشتی چاوەڕوانی کارەساتێکی زۆر گـەورەی لێ دەکەن، ئەمەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ جاهلیـەتی ڕۆژئاوا کە نەیتوانیوە مرۆڤ ئارام ودڵشاد بکات.

❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖

## فقهی واقیع

ئامادەکردنی: هادی عمر
کۆلێـژی: پزیشـکی.

یەکێکـە لـەو مەسـەلە گرنگانـەی کـەوا زوڵمـی لێ کراوە وباسی لێـوە نـاکرێت و پشت گـوێ خـراوە کـەدەتوانین بڵێـین یەکێکـە لەمەسـەلە هـەرە گرنـگ وبایـەخدارەکانی گۆڕەپـانی بانگـەواز وکـاری ئیسلامی بەتایبـەتی ئێمڕۆ زۆر کارمـان پێیـەتی بـەهۆی زۆر بوونـی پیلانـی نـوێ وجۆراو جـۆری کوفـری هـاو چـەرخ دژی موسڵمانان وبانگـەوازی ئیسلامی، بۆیە پێویستە هەموو موسڵمانێکی ئەو گۆڕەپانـە بزانێـت فقهـی واقـع چییـەو؟ لـەرووی شەرعیەوە حوکمـی چییـەو؟ مەبەسـت لـەزانینی چییە؟ بەبێ ئەوەی بکرێتە بەهانەو کاری ناشەرعی وبیدعـەکاری پـێ ڕەواج بـدرێ گوایـە واقیـع سـەپاندوویەتی وپێویسـتە خۆمـانی لەگـەڵ بگونجێنـین، لەئـەنجامدا موسـڵمان ببێتـە هـەوێری واقـع وچۆنـی بوێـت وا موسـڵمان ،بشـێلێت بەپێچەوانەشەوە نابێت لەبایەخ وگرنگیەکەی کەم بکرێتەوە وبەشتێکی بێ نرخ لەقەڵەم بدرێت، نابێت موسڵمان خۆی واتێ بگات کەلەدەوڵـەتی ئیسـلام دەژی، یـان واتـێ بگـات کەسـەردەم سـەردەمی شمشێرو تیروکەوانە وئیسلام پێویسـتی بـەتانك وچەکی نوێ نییە وهەوڵ دان بـۆی کـات بەفیرۆدانـە، یـان واهەسـت بکـات کـە هـەموو دەوروبـەری موسـڵمانەو پێویسـتی بـەچاودێری وهەستیاری نییە هەرەمکو دەگێڕنەوە دەڵێن جارێك

ووتـار خوێنێكـی موسـڵمان ووتـاری‌دەدا لەسـەر كتابەكـەی پـاش تـەواو بوونـی ووتارەكـە لـەناو دوعایەكان دوعای بۆ خەلیفەیەكی عوسمانی‌یەكان كرد كەئەو كاتـە ئێسكەكەشی نەمابوو وخیلافەتی ئیسـلامیش لـەنێوان داگیركـەرانی رۆژهـەلات ورۆژئاوا وەك گۆشتی خێریٚ دابەش كرابوو، ئەوەتا دەبینین لەهەندێك شوێن موسڵمانان جاری وادەیە موناقەشـەو خیـلاف لەسـەر مەسـەلەیەكی فیقهـی ئاسـان یـان مەسـەلەیەك كـەجیهانی ئـەمرۆی موسڵمانان پێویسـتی پی‌نی‌یـە دروسـت دەكـەن هـەروەكو بلـیٚ موسـڵمان لـەو پـەڕی كامـەرانی وئـارامی‌دا بێـت تـەنها ئـەو شـتانە مـابێت یـەك لا بكرێتەوە.

بـیٚ گومـان لای هـەموو موسـڵمانێكی خـاوەن بیروبـاوەڕێكی راسـت روون وئاشـكرایە كەهـەردوو چینەكەی سەرەوە بەهەڵەدا چوونە، چونكە شەیتان (لعنـه اللـه) یـان بـەزیادە ڕۆیـی ((افـراط)) یـان بەكەمتەرخـەمی ((تفریـط)) موسـڵمان لـەكاری شەرعی وخێر دوور دەخاتـەوە. ئەوەش نكوولـی لیٚ ناكرێت كەهەردوو چین گوتەو كردارەكانیان دەدەنە پـاڵ سەلەفیەت وخۆیان بەتاكە سەلەفی گوزەیـان دەزانن.

فیقهی واقع مانای چی‌یە وگرنگی‌یەكەی چی‌یە؟

واتـە شارەزایی ووشیاری وچاپووكی موسڵمانان لەبارەی ئەو سەردەمەی كەتێیدا دەژین وئەو رووداو وكارەسـاتانەی لـەدەورو بـەری روو دەدەن هـەروەها شارەزابون وتی‌ڕوانینیٚ كی وورد لەو هەموو پیلان وفێڵ وتەڵەكەو داوەی كە بۆیان دەنرێتەوە لەهەموو لایەكەوە.

بەڵگـەشمان لـەم رووەوە لـەقورئان وسـوونەتی پێغەمبەر ﷺ وژیانی سەلەفەوە زۆرە. خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿وكذلك نفصـل الآيـات ولتسـتبين سبيل المجرميـن﴾ الانعـام (٥٥). "ابـن كثـير" - رەحمـەتی خـوای لیٚبـیٚ- دەڵـیٚ: واتـە بـۆ ئـەوەی ڕێگـای ئـەو تاوانكارانـەی كەدژایـەتی پێغەمبـەران وبەرنامەكانیان دەكەن روون وئاشكرا بێت.

"سید قطب"یش - رەحمەتی خوای لیٚبیٚ - لە (في ظـلال القرآن) دەڵیٚ (ئەو بەرنامەیە واتـە ئیسلام تـەنها گرنگـی نـادات بـەروون كردنـەوەی حـەق وئاشكرا كردنی بۆ ئەوەی رێگای باوەڕداران روون بكاتـەوە، بـەڵكو لەگـەڵ ئـەوەش گرنگـی دەدات بـە روون كردنـەوە وئاشكرا كردنی ناحەق (باطل) بـۆ ئەوەی رێگای سـەر لێشێواو وتاوانكـاران ئاشـكرا بكات، چونكە روون بوونـەوەی رێگـای تاوانكـاران پێویستە بۆ روون بوونـەوەی رێگـای بـاوەڕداران.)

قورئانی پـیرۆزیش پـڕە لەو ئایەتانـەی كـە رێگـای دوو روو (منافق) و جولەكەو خاچ پەرستان ریسوا دەكـات وئابروویـان دەبـات. ئـەوەش هـەمووی دەكەوێتە ناو بازنەی فیقهی واقع.

هەروەها ئەگەر لەسیرەی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ بكۆڵینەوە كەچەند بایەخی بەو مەسەلەیە داوە، بۆ نموونە لەكۆچ كردنی یەكەم كاتێك موسـڵمانەكان لـەو پـەڕی بـیٚ هـێزی ولـەئازاردا بـوون فـەرمانی پی‌كردن كە كۆچ بكەن بۆ حەبەشە لەبەر ئـەوەی پاشایەكی لیٚیە كەس لەلای ئەو زوڵمی لیٚ ناكرێت، ئـەوەش بەڵگـەیـە لەسـەر ئـەوەی كەپێغەمبـەر ﷺ شـارەزایی لەدەوروبـەری خـۆی هـەبوو ئەگـەرنا فـەرمانی پـیٚ دەكـردن كـەكۆچ بكەنـە بـۆ لای رۆمەكان كە ئەوانیش ئەهلی كتاب بوون. هەروەها چـۆن مەدینـەی هـەڵبژارد كـە ببێتـە شـوێنی كـۆچ كردنـی دووەم ولـەویٚ بانگـەوازی ئیسـلامی پـەرەی پیٚ بدریٚ، هەروەها چۆن هەڵس وكەوتی لەگەڵ ئەو هـەموو هـۆزو عەشـیرەت وبیروباوەڕانـە كـرد كەلەدەوروو بەری دەژیان، بیٚ ئەوەی بتوانن زیانی پیٚ بگەیەنن وبانگەوازەكەی لاوازبكەن.

ئەو شتەش زیاتر لەشەڕەكان ونامەكانی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ میللـەتان وپاشـاكان وهۆزەكـان روون دەبێتـەوە، هەروەها چۆنیـەتی هەڵس وكەوت كردن لەپێشـوازی كردنـی ئـەو نوێنەرانـەی (وفـود) كەدەهاتن بۆلای. بەڵگـەیەكی زینـدووی تـر لەسـەر گرنگی فیقهی واقع ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ كـە دەبـیٚ موسـڵمان وەك یـەك لاشـە بـن كـاتێك ئەندامێكی لەشی ئازاری پی‌دەگا ئەوا هەموو لەشـی تووشـی نارەحـەتی وئێـش دەبێـت، بـیٚ گومـان موسڵمان دەبیٚ وابیٚ كاتێك موسڵمانێك لەو پـەڕی رۆژهەلات یان ئەو پەڕی رۆژئاوا زوڵمی لیٚ دە كریٚ دەبـیٚ هـەموویان هەسـت بـەئازارو مەینەتیـەكانی بكەن ومشوری بۆ بخۆن وبەدووای چارەدا بگەڕێن

ئەوەش جێبەجێ ناکرێت ئەگەر شارەزاییمان لەواقیع وسەردەمی خۆمان نەبێت هەر ئەو شارەزاییەشە وا لەموسڵمان دەکات کە دووچار لەیەك کون مار پێوەی نەدات. گرنگی دانی سەلەفی صلح بەفیقهی واقع لەو شەڕەی کەلەنێوان فارس وڕۆمەکان ڕوویدا ڕەنگ دەداتەوە کەچۆن حەزیان دەکرد ڕۆمەکان سەرکەون چونکە ئەهلی کتابە بوون بەڵام فارسەکان بت پەرست بوون ئیمامی عومەریش (رضی الله عنه) دەیگوت (ما أنا بالخب ولا الخب یخدعني) واتە (نە من فێل بازم ونەفێل بازیش دەتوانێ هەڵم خەڵەتێنێ).

ئایا فیقهی واقع لەڕووی شەرعەوە حوکمی چییە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین هەندێك شارەزایی هەیە واجبە، هەندێکیان سوننەتە وبەشێکیشی ڕێپێ دراوە (مباح)ە بەڵام هەیانە گوناهن.

(١) ئەو شارەزاییانەی کەواجبن:- وەکو هەموو ئەو شتانەی کەپەیوەستن بەبیروباوەڕ زانینیان مەرجە بۆ سەلامەتی بیروباوەڕ وەك زانینی جۆرەکانی شرکی نوێ کەزۆر بڵاون لەناو خەڵکی وخۆیان لەپێستی مەڕ حەشارداوە وکاڵای نیفاقیان پۆشیوە بۆ ئەوەی تووشی ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕاستەوخۆ نەبنەوە، ئەگەر موسڵمان شارەزایی لێیان نەبێت ونەیانناسێت لەوانەیە تووشی شرکی گەورە بێت کەخوای گەورە بەهیچ شێوەیەك لێی خۆش نابێت وەکو خۆشەویستی وسەرخستنی ویارمەتی دانی تاغوت وکافران، یان لەوانەیە ببێتە پرد بۆ پەڕینەوەی کوفر وزیانی موسڵمانان بێ ئەوەی هەست بکات. لەئەنجامی گوێ نەدانی زۆربەی موسڵمان بەو لایەنە گرنگە دەبینین هەتا ئەوانەی کەخۆیان بەمشور خۆری ئەو دینە دەزانن بانگەواز بۆ دیموکراتیەت ونەتەوایەتی ونیشتمان پەروەری دەکەن وپشتگیری لێ دەکەن، ئەوەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لەئیسلام، ئەگینا چۆن (گەل) دەکەنە هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار لەحوکم وبەرنامە دانان.

هەروەکو پێشتر ووتمان لەبەر ئەوەی یارمەتیدان وسەرخستنی موسڵمانان واجبە کەواتە شارەزابوون لەدەنگ وباسی وحالیان واجبە، پێغەمبەر ﷺ دەڵێ:- (من حمی مؤمنا من منافق بعث الله ملکا یحمي لحمه یوم القیامة من نار جهنم) صحیح سنن أبي داود. لەحەدیسێکی تر دەڵێ (مامن أمرىء یخذل امرءا مسلما في موطن ینتقص فیه عرضهٌ وینتهك فیه حرمته الا خذله الله تعالی في موطن یحب فیه نصرته ومامن أحد ینصر مسلما في موطن ینتقص فیه من عرضه وینتهك فیه من حرمته، إلا نصره الله في موطن یحب فیه نصرته) رواه احمد وأبو داود، صحیح الجامع الصغیر.

٢- ئەو شارەزاییانەی سوننەتن:- ئەوەش هەموو زانستە دونیانییە بەسوودەکانە دەگرێتەوە کە ئوممەتی ئیسلامی پێویستی پێی دەبێت وەکو زانستی سەربازی وئابووری وپیشە سازی... هتد. بەڵام ئەگەر کەس پێی هەڵنەستا ئەوە دەبێتە واجب.. والله أعلم.

٣- ئەو شارەزاییانەی گوناهن:- ئەو شتانە دەگرێتەوە کەخۆ خەریك کردن پێیان حەرامە، وەك ئەو مەسەلانەی کەواقع دەیسەپێنێ موسڵمان دەبێت خۆی لێ بپارێزێت وتێیدا نەتوێتەوە وشوێن پێی کفر هەڵنەگرێت کوفر چیکرد ئەویش هەوڵی لاسایی کردنەوەی بدات[١] بە حوکمی ئەوەی دەیەوێ خۆی لەگەڵ واقع بگونجێنێت.

❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖

## ناوەڕاستیەتی لە ئیسلامدا

## ﴿ الوسطیة في الاسلام ﴾

ئامادەکردنی: ئاسۆ مهدی

کۆلێژی پزیشکی

خوای پەروەردگار شوێنەواری دانایی وکار لەجێیەتی لەسەر هەموو ئافەریدەیەك بەجێ هێشتووە بەجۆرێك هاوسەنگی ورێك وپێکی لە گشت وورد و درشتێکی بوونەوەر دەبینرێت بگرە لە ئاسمان سەرباری ملیۆنەها ئەستێرە لە بۆشایی

[١] مەبەستم چاولێ کردنە لەشتی پڕوو پووچ وبێ سوود نەك زانست وتەکنولۆژیا.

ئاسمان هەر یەکێکیان خولگەی دیاری کراو وخوولانەوەیەکی هاوسەنگی هەیە لەگەڵ ئەستێرەکانی تر ﴿ كلٌّ في فلكٍ يسبحون ﴾ الانبیاء:(٣٣) هەروەها زەوی ومانگ وخۆرو شەوو رۆژ ﴿ وجعلنا الليل لباسا وجعلنا النهار معاشا ﴾ النبأ:(١٠-١١) تەنانەت دڵۆپە ئاوی باران یەك بەیەك هاتوونەتە ژمار پێش ئەوەی لە هەور دەربچێ ﴿ وانزلنا من السماء ماء بقدر فاسكناه في الارض ﴾ المؤمنون (١٨) بۆیە هیچ گەردیلەیەك لە بوونەوەر بۆ ی نی‌یە کەمێ یان زیادی‌یەك بنوێنێ لە کار و فرمانەکانی ﴿ انا كل شيء خلقناه بقدر ﴾ القمر(٤٩) مرۆڤیش مشتێکە لەم خەوارە ﴿ وعلى الله قصد السبيل ومنها جائر ﴾ النحل: (٩). مجاهدی کوڕی جبر دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێ:( قصد السبيل: المقتصد فيها بين الغلو والتقصير،) واتە: ئەو کەسەی میانڕەو وناوەراستە لە کاروکردەوکانی بەبێ زیادەڕەوییکی زیاد لە پێویست یان کەمڕەوییکی بێ سوودو قازانج. هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿وابتغ فيما آتاك الله الدار الاخرة ولا تنس نصيبك من الدنيا ﴾ القصص:(٧٧)بۆیە خوای پەروەردگار ئیسلامی کرد بە هەڵبژاردەو گوشراوی هەموو ئایینە کانی تر وموسڵمانانیش شاهیدو دادپەروەری هەموو گەلانی ترە ﴿ وكذلك جعلناكم امة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا ﴾ البقره: (١٤٣) کەواتە عەقیدەی ئیسلام، شەریعەت وبیروبۆچوون وچەمكـ وتێگەیشتوە داب ونەریتی ئیسلام ناوەراستترینی گشتیانە. هەرچی عەقیدە وبیروباوەڕی ئیسلامە میانڕەوو ناوەراستە لە نێو هەموو بیرو بۆچوونە پووچ وگڵاوەکانی تر کە ناویان دەدەنە پاڵ ناوی ئیسلام وەك (جهمیە ومعتزلە ورافضە وخوارج و...) کە لە خاڵێك یان زیاتر لە خاڵێك لە گەل ئیسلام یەك ناگرنەوە ( ابن تیمیە)ش ڕەحمەتی خوای لێ بێ هەر لەم گۆشەیەوە تیشك دەخاتە سەر ئەم بابەتە ودەفەرموێت( کۆمەڵی سوونەت وجەماعەت- اهل السنة والجماعة-) کە تاکە کۆمەڵە دەچنە بەهەشت هەروەك لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ

باسکراوە- ناوەراستترینی هەموو دەستەو کۆمەڵێکەوە لە بابەت عەقیدەی ئیسلام هەروەك ئیسلام ناوەڕاستترینی ئوممەتەکانە، چونکە ئەوانە- اهل السنه والجماعه- میانڕەوو ناوەڕاست خوازن لە نێوان ئەوانەی سیفەتە بەرزەکانی خوای پەروەردگار لە کاردەخەن یان بەرجەستەو هاوشێوەی دەکەن لە گەڵ سیفەتە کەم وکوڕەکانی بەندە، هەروەها عەقیدەی ئیسلام ناوەراستە لە نێوان ئەوانەی وادەزانن خوای پەروەردگار هیچ دەسەڵات وتوانایەکی نی‌یە بەسەر کردەوەکانی بەندە یان ئەوەتا بەندەی لاواز ناچارە ئەوەی چاك وخراپە بیکات بەبیانوی ئەوەی قەدەری خوای پەروەردگار لە سەری فەرزکردوون وئەوانیش هیچ دەسەڵاتێکیان نی‌یە بەسەر قەدەر. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تر عەقیدەی ئیسلام ناوەراستە لە نێوان ئەوەی هەموو هەڵس وکەوت و جووڵەو وەستانێك لە گەڵ کۆمەڵ و دەوروبەرو خەڵکی تێنەگەیشتوو بە کوفر وشرك وچوونە دەرەوە لە ئیسلام بزانێت یان ئەوەتا گرنگترین وپتەوترین کۆمەڵگە وبابەتی عەقیدەی ئیسلامی پشت گوێ بخات و دەست لە ناو دەست کوفر بنێت ولە خزمەتکردنی بەرنامە پووچەکانی دوانەکەوێت، بەڵکو یارمەتیشیان بدات، بەڵکو ئامادەبێت لەسەریەك مێز لەگەڵیان دابنیشێت و (وخاڵی هاوبەش) لەنێوان ئیسلام و ئەم بەرنامە پووچەڵ ونزمانە بدۆزێتەوە. کەواتە عەقیدەی ئیسلامی لە لایەك دوورە پەرێزە لە واقیعێکی جاهیلی وخەڵکێکی تێنەگەیشتوو چونکە عەقیدەی ئیسلامی خاوەن چەند سنوورێك ودوورێنیکی(أبعاد) دیاری کراوە بۆیە موسڵمان ناتوانێت خەڵك ئاسایی هەڵس وکەوت وبەچاك وخراپ لە گەڵیان بێت و حەرام وحەڵاڵ تێکەڵ بکات، لە هەمان کاتیشدا جیا نابێتەوە لە واقیع ودەوروبەر بەجۆرێك نەتوانێت خەڵك لە ئیسلام بکەیەنێت. هەرچی شەریعەت وخواپەرستی‌یە ، ئیسلام ناوەراستە لە نێوان ئەوەی موسلمان خۆی لە خەڵك جیا بکاتەوە و لە ئەشکەوت ومزگەوت خۆی حەشاربدات بەبیانوی ئەوەی خواپەرستی دەکات چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

(لارهبانية في الاسلام)[1]: هەروەها ئیسلام ڕێگە بەوە نادات موسوڵمان هەموو ژیانی خۆی بەشەونوێژوو نە نوستن و بەڕۆژووبون و برسیەتی وژن نەهێنان و حەرام کردنی بەشی خۆی لە دونیا بەسەربەرێ هەروەك ئەو سێ کەسەی هاتنە ماڵی یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی پرسیار بکەن لە خوا پەرستی پێغەمبەر ﷺ، کاتێك وەڵامیان درایەوە بەکەمیان زانی بۆ خۆیان و فەرموویان:ئێمە لەکوێین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکا خوای پەروەردگار لە گوناهی پێش وپاشی خۆش بووە؟ ئینجا یەکێکیان فەرمووی :تاژیانم ماوە هەر شەو نوێژدەکەم ،ئەوی تریان فەرمووی منیش تاماوم بەڕۆژوو دەبم و هیچ خواردنو خواردنەوەیەك ناخۆم ،ئەوی تریشیان فەرمووی : منیش تا ماوم ژن ناهێنم و لێیان نزیك ناکەومەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاتە ژورەوەو فەرمووی :ئێوە بون واتان گوت؟ سوێند بێ بەخوای پەروەردگار من لەهەموتان لەخواترسترو بەتەقواترم بەلام من بەڕۆژوەدەبم و خواردن دەخۆمو دەخەومو شەو نوێژ دەکەمو ژنیش دەهێنم و هەر کەسێکیش لەسەر سونەتم لابدات لەمن نییە "متفق عليه" دووبارە ئیسلام ڕازی نابێت بەندەی خۆی ئەزیەت بدات ئەرکێکی وا بخاتە سەر شانی نەتوانی پێی هەڵسێت چونکە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿لايكلف الله نفسا الا وسعها﴾ البقرة(٢٨٦) باشە ئەگەر خوای پەروەردگار ئەرکێك بەبەندە ڕانەسپێرێت کە لە هێزو توانای نەبێت چۆن بەندەی لاواز ئەرك و فرمانی زیاد لەتوانای خۆی لەسەر خۆی فەرز دەکات ،بۆیە هەروەك أبن عباس خوا لێیان ڕازیبێت دەفەرموێت :جارێکیان پێغەمبەر ﷺ خوتبەی دەدا کاتێکیان بینی پیاوێك ڕاوەستاوە، پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری کرد ئەوەکێ یە؟ فەرموویان ئەوە:ابو اسرائیل،نەزری لەگەڵ خوای پەروەردگار کردوە لەبەر ڕۆژ ڕاوەستێ و نەچێتەژێر سێبەر وقسە نەکات و بەڕۆژوش بێت ،پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پێی بڵێن با قسە بکات و بچێتەژێر سێبەرو دابنیشێو ڕۆژوەکەشی تەواوبکات "رواه بخاری ،بروانە برای موسوڵمانم پێغەمبەر ﷺ نەی فەرموو بارۆژوەکەشی بشکێنێ چونکە بەرۆژوبونەکەشی شەرعی بوو بە پێچەوانەی کارەکانی تر. کەواتە کەئیسلام ڕێگەنەدات بەزیادە ڕەوی کردن لەخوا پەرستی یەك کەخوای پەروەردگار پێی ڕازی نییە پێغەمبەریش ﷺ نەی کردووە هەروەها ئیسلام ڕێگە نادات هیچ کەسێك کەم تەرخەمی بکات لەخوا پەرستی بەجۆرێك نوێژەکان نەکات یان بیانچوێنێ تەنانەت ڕێگەبەوەنادات نوێژی جەماعەت تەرك بکات یان تەمبەڵی تیا بکاتو خۆی خەریك بکات بە موحازەرەخوێندنەوەو توپی پێ و تێنس و پیاسەکردن ......یان ئەوەتا ڕۆژونەگرێت و یان هەندێکی بگرێت بەبیانوی تاقی کردنەوەو لاوازبونی لەشو هتد...... کەواتەئیسلام ناوەڕاستە لەزیادە ڕەوی کردن لە خواپەرستی و کەم تەرخەمی کردن تیایدا . هەروەها ئیسلام ناوەڕاستە لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکو دەوروبەردا بە جۆرێك ڕێگەنادات بانگەواز بۆئیسلام نەکرێت وبانگەوازیکار خۆی لە واقیع ودەوروبەر ڕیشەکێش بکات و هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵك نەکات و لێیان دورە پەرێز بێت چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿أدع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن﴾ هەروەها ئیسلام ڕێگە بەوە نادات بانگەوازیکار بەجۆرێك تێکەڵوواقیع وخەڵك بێت خۆی لە بیر بکات و سنورەکانی ئیسلام ببەزێنێ شوێن کەوتەی هەواو نەفس و ئارەزوو چەند دەستکەوتێکی نزمو بێ نرخ بێ . دووبارە ئیسلام ناوەڕاستە لەنێوان ئەوەی پەردە لەسەر ڕوی ڕەشی مونافیقانو ناحەزانی بماڵێ وە بەخەڵکیان بناسێنێ بۆ ئەوەی لە فرو فێڵیان ئاگاداربن ، ولەنێوان ئەوەی کەمو کوڕیو هەڵەکانی برای موسوڵمانی چاوپۆش بکات و لێی ببورێ . بەلام بانگەوازیکار دەبێ ئەوەی لەبیر نەچێت کە فەرمودەی پێغەمبەر

[1] ڕهبانیە: لە(راهب)ەوە هاتووە ئەوکەسەی خۆی لەخەڵك جیادەکاتەوە دونیا تەرك دەکات بەبیانوی خوا پەرستی وەك ڕاهبەکانی دیانەکان.

ﷺ "من حسن اسلام المرء تركه ما لا يعنيهُ حديث حسن رواه الترمذي وغيره ، واى لێنەكات ئەمر بەچاكەو نەهی لە خەراپە نەكات یان ئەوەتا فێڵ وتەڵەكەی مونافیقان ئاشكرا نەكاتو بەدوای نەگەڕێت هەروەك نابێ بانگەوازیكار دەستی بخاتە ناو ئیشێك پەیوەندی پێوە نەبێت. برای بەڕێزم،خوشكی موسوڵمانم ئەوەی باسكرا لەناوەڕاستیەتی ئیسلام مشتێك بوو لە خەروارێك ئەگینا ئیسلام لەگشت بوارو مەیدانی ژیاندا ناوەڕاستەو میانڕەو بۆ نمونە كاتێك خوای پەروەردگار باسی بەخشین دەكات ناوەڕاستی ئیسلام پیشان دەدات ﴿ والذين إِذا أنفقوا لم يسرفوا ولم يقتروا وكان بين ذلك قواما ﴾ الفرقان:(٦٧) (لم يسرفوا) واتە دەست بڵاوی ناكەن ،(لم يقتروا) واتە دەست ناقوچێنن بۆ پارە بەخشین ،بەڵكو(وكان بين ذلك قواما) :ناوەڕاستی لەنێوان ئەموو ئەو .هەروەها كاتێك خوای گەورە باسی قورئان خوێنەوە دەكات لە شەو نوێژدا:﴿ولا تجهر بصلاتك ولاتخافت بهاوابتغ بين ذلك سبيلا﴾الاسراء (١١٠) دەفەرموێ (ولا تجهر بصلاتك) واتە :دەنگ زۆر بەرز مەكەوە هەروەها (ولا تخافت بها) واتە: دەنگت ئەوەندە نزم مەكەوە ئەوانەی لەدوات نوێژدەكەن گوێیان لێنەبێت بەڵكو (وابتغ بين ذلك سبيلا) ناوەڕاست بە لەنێوان ئەمونەو هەروەها كاتێك باسی ڕۆیشتن دەكات لەسەر زمانی لقمان﴿واقصد في مشيك﴾ لقمان(١٩) واتە لەڕۆیشتنت دا ناوەڕاستبە لەنێوان پەلەكردنو دواكەوتن هەروەها كاتێك خوای گەورە دێتە سەر هەڵس وكەوت كردن لەگەڵ كافری شەڕكەرو شەڕنەكەر ناوەڕاستی ئیسلام پیشان دەدات ، لەلایەك دەفەرموێت ﴿لا ينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم ان تبروهم وتقسطوا اليهم ان الله يحب المقسطين﴾الممتحنه.(٨) بۆ ئەوەی موسڵمان ناوەڕاست بێت لە نێوان چاكە كردن لەگەڵ كافری شەر نەكەر بەلأم ﴿انما ينهاكم الله عن الذين قاتلوكم في الدين واخرجوكم من دياركم وظاهروا على اخراجكم ان تولوهم ومن يتولهم فاؤلئك هم الظالمون﴾ الممتحنة (٩). خوای پەروەردگار ڕێگە بە موسلمان نادات خۆشەویستی وپشتگیری هەبێت بۆ كافرێكی شەڕكەر ﴿وكذلك جعلناكم امة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا﴾ البقرة (١٤٣).

❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖

## لەژەهرەكانی دڵ

### زیادە ڕۆیی لە تێكەڵ بوون (فضول المخالطة)

بەشی دووەم

ئامادەكردنی: كارۆخ عبدالعزیز

كۆلیژی: پزیشكی

برلیان خوشكان دووەم ژەهر لە ژەهرەكانی دڵ بریتییە لە زیادە ڕۆیی لەتێكەڵبوون بەوخەڵكانەی كەلە قسەی پڕوپوچ وبێكەڵك بەولاوە هیچی تر نازانن. ئەوكەسانەی كە﴿يعلمون ظاهرا من الحياة الدنيا وهم عن الاخرة هم غافلون﴾ الروم(٩) خۆشەویستان كاتێ تەماشای ئەمڕۆی موسوڵمانان دەكەین زندەڕۆییەكی بەرچاولەم ڕووەوەدەبینرێت، وەنەبێ مەبەستمان ئەوەبێ كەموسوڵمان گۆشەگیربێ و تێكەلأوی خەڵك نەبێت ولەگەڵ(واقيع) ڕەفتار نەكات،نەخێربەڵكو مەبەستمان دیاریكردنی ڕێگە (شەرعی)یە كەیە لە بارەیچۆنییەتی تێكەلأوبوونی بەخەڵك وەنەبوونیبە هۆكارێك بۆ دابەزینی بڕوای(أيمان) موسوڵمانان وبێبەش كردنیان لە تام وەرگرتن لە-خلوە-(واتە بەتەنیا دانیشتن وبەتەنیا مانەوە) لەگەڵ خوای گەورە، بێگومان ئەم كارەش هاندەرێكە بۆ پێداچونەوەو چاوخشاندنی مرۆڤی موسوڵمان و(محاسبه)كردنی نەفسی خۆی ڕووەو ئەو كارانەی ئەنجامی داوە بێگومان تەنیا تێكەڵبوون بەخەڵكانی دوور لەئاینی پیرۆزی ئیسلامەكە ئەم كارەی سەرەوەمان لەدەست دەدات.لەگەڵ ئەوەی كەئەمخەڵكە دوور لەئاینانەش(باشتر بڵێین ئەم خەڵكە ستەمكارانە )لەڕۆژییدوایی هەر پەشیمانیان بۆ دەمێنێتەوە

﴿ويوم يعض الظالم على يديه يقول يا ليتني اتخذت مع الرسول سبيلا، ياويلتا ليتني لم اتخذ فلانا خليلا﴾ الفرقان(٢٦-٢٩) واتا ئەوڕۆژەی كەستەمكاران پەنجەی خۆیان دەگەزنو دەڵێن خۆزگە ڕێگای ڕاستم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بگرتبوایەبەر قوڕبەسەرم بریا فلانە كەسم نەكردبوایە برادەرو خۆشەویستی خۆم، بە ڕاستی ئەو لەقورئان و ڕێگای ڕاستی(ڕێگای وە بیرهاتنەوە) ی لادام كاتێ كەبۆم هات وەبەڕاستیش شەیتان زۆر سەرشۆڕكەرە بە مرۆڤ (واتە ڕۆڵێكی دیاری هەیە ) . بەڕاستی لەزۆرتێكەڵاوبوون دۆڕاندنی دونیاو قیامەت ڕوودەدات، وەدڵ پڕدەكات لە دووكەڵی ئارەزووهەوای خەڵكی تاوای لێدەكات هەمووی ڕەش دەكات وەوالەمرۆڤ دەكات كە باركرانی باركەی خراپەكاری برادەرە خراپەكانی هەڵگرێ .واتە لەبرادەری خراپ بەولاوە كێ هەیە كەوا لە مرۆڤ بكات كە لە ڕێگەی ڕاستی ئیسلامەتی لابدات وەك چۆن (أبوطالب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ یان لاداو نەیان هێشت تەنانەت یەك ووشە لەدەمیەوە دەرچێت ئەو ووشەیەی كەوا پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی پێدا بوو گەر دەری ببڕێ بۆی دەكاتە شەفاعەتێك لەبەردەم خوای گەورە كەئەویش ووشەی (لا اله الا الله) بوو لەگەڵ ئەوەی كەوا ئەبو تالیب ئەیزانی ئەم دینە ڕاستەو خوایەكەش حەقە پێغەمبەریش ﷺ ڕاست گۆیەلە بەڵێنەكەی، وەكو چۆن خۆی دان بەم ڕاستییە دادەنێ ودەڵێت :-

ولقد علمت بان دين محمدٍ
من خير اديان البرية ديناً
لولا الملامة أو حذار مسبة
لوجدتني سمحاً بذلك مبيناً
والله لن يصلوا اليك بجمعهم
حتى أوسد في التراب دفيناً

برایان خوشكان :-

یەحیای كوڕی موعاذ دەفەرمووێ :-( الذي حجب الناس عن التوبة طول الامل وعلامة التائب: إسبال الدمعة وحب الخلوة ومحاسبة النفس) واتە: ئەوەی ڕێگەی تەوبە كردن لە خەڵك گرتبێ دووری هیوایە بە دونیا، وە نیشانەی مرۆڤی تەوبەكاریش بریتییە لە فرمێسك ڕشتن وحەزكردن لەتەنیا دانیشتن وموحاسەبەكردنی خۆ).

واتە ئەو موسوڵمانەی كە هەڵدەستێت بە تێكەڵبونێكی لە ئەندازەبەدەری بێ سوود ئەوا ئەم سێ نیشانەی مرۆڤی تەوبەكاری لە دەست دەچێت چونكە ناتوانێ وڕێی ئەوەی نییە بگرییێت لەناو خەڵكا-لەترسی ریاء- وەناش توانێت-خلوة-بكات چونكە بونی لەناو خەڵكا پێی ناوترێت خلوە وەناشتوانێت موحاسەبەی خۆی بكات چونكە موحاسەبەكردنی-نفس- تەنها لە -خلوة- دادەبێت، بۆیە دەبینین -السلف الصالح- ڕەحمەتی خوایان لێبێت زۆر حەزیان لە تێكەڵ بوونی بێ سوودنەبوە چونكە ئەیان زانی ئەگەر ئەم كارەبەجێ بگەیەنن ئەوا -حب الخلوة -یان لەدەست دەدات چونكە ئەم دووانە دووكاری دژیەكن، یان ئەوەتا ئەگەرحەزیش لە-خلوە-بكات ئەوا ناتوانێت بكات بەوتامەی كە -السلف الصالح- لێیانەوە وەرگرتوە ئەوەتا حبیب ابومحمد لەماڵەوە زۆر بەتەنیا ئەماوەو ئەیوت ' من لم تقر عينه بك فلا قرت عينه، ومن لم يأنس بك فلا أنس ، وە بەمالكی كوڕی مغفلیان ووت كاتێ لەماڵەوە بەتەنیا دادەنیشی:أفلا تستوحش ؟واتە ئایا هەست بەدڵتەنگی‌و تەنهایی ناكەیت لەوەڵام دا فەرمووی :أويستوحش مع الله أحد ) واتە توخوا كەس لەگەڵخوا هەست بەتەنیایی دەكات، وە -مسلم بن عابدٍ- فەرمویەتی: لولا الجماعة ما خرجت من بابي أبداً حتى اموت ) وە سوفیانی (ثە وریش) زۆر دڵخۆش دەبوو كاتێ شەوان دەگەڕاوە ماڵەوە وەبەپێچەوانەشەوە غەمبار دەبوو كەبە ڕۆژ دەچوە دەرەوە) وە- حسن البصری - كاتێ بەناو بازاڕی بەسرادا دەچوو ،وورد دەبۆوە لە قسەكانیان كە زۆربەی زیادەڕەوی بوو -ئەی فەرموو من شایەتی ئەوەدەدەم كەشەوی‌ئەوانە شەوی زۆر خراپن -واتە هیچ خێرو بەرەكەتوو چاكەو شەو نوێژی تێدا نییە- زۆر بەداخەوە ئەگەر - حسن البصری -ئەوها بەخەڵكی بازاڕی سەردەمی خۆی بڵێت ئەوا دەبێ چی بەئێمەی بەستەزمان بووتایە كاتێك ئێمەی بدیتایە بەتایبەت لەوشوێنەی كەئێمەی تیایدا زانست وەردەگرین (مەبەست كۆلیژو شوێنەكانی

تــره )بەتايبــەت ئەوموســوڵمانە نەشــارەزايانەی كــەرەفتاريان وەك رەفتــاری كەســانی (جــاهل) نەشارەزا وايە لەو باوەرە داین کە _ حسن البصـری _خۆی بۆ رانەدەگیراو دەیگووت :- انا لله وانا اليـه راجعون ولاحول ولا قوة الا بالله ) ئينجا بابزانين زانایان تێکەڵبونيان کردۆتـە چەند جۆرو وە چۆن جۆرەکانیــان هەڵســەنگاندومو چــۆن داوامــان لێ دەکەن کەرەفتار لەگەڵ هەرجۆریاندا بکەین

برایان خوشکان :-

زانایان تێکەڵ بونیـان کردۆتـە چوار جۆر کە لـەم چوارە دەرناچێت ئەم جۆرانەش :-

١- ئـەو جـۆرە کەسـانەی کەتێکـەڵبوونیان وەکـو خواردن پێویستە بۆ مرۆڤ کـە بـەرۆژو بـە شـەو ناتوانێ بەبێ ئەوان ژیان بباتـە سەر بۆیە زۆربەی کاتەکان پێویستی بە تێکەڵبونی ئەوان هەیە وە لە تێکەڵبونیان سودێکی زۆر وەردەگرێت وەکو أبـو درداء فەرمویەتی سێ شت نەبوایـە تەنانـەت یـەك رۆژیش حـەزم لـە ژیان نـەدەکرد وە یەکەکیش لـەم سێ شتانە (مجالسة أقوام ينتقون أطايب الكلام كما ينتقي أطايب الثمر) واتە دانیشتن لەگەڵ کەسانێك کەقسەی چاك هـەڵدەبژێرن وەکـو چـۆن بـەروبومی چاك لەدار لێدەکرێتەوە بەتايبەت ئەوەی گەییوە )

٢-ئەوانــەی تێکــەڵبونیان وەك دەرمــان وایــە کــە پێویستیمان پێدەبێ لەکاتی نەخۆشی ،کەواتە هـەر کاتێ ساغ ودروست بوین پێویستیمان پێیان نابێت ، وەکـو ئەوشـتانەی کـەمرۆڤ نـاتوانێت بـە هیـچ جۆرێـك لێیـان جیابێتـەوە لەپێویسـتیەکانی ژیـان وبوونیدا ،وەك هەموو جۆرە رەفتارە سروشـتیەکانی رۆژانە (لێرەدا مانـەوەشمان دەگرێتـەوە لـەزانکۆدا) کەواتە ئەگەر پێویستی خۆت تـەواو کرد رووە ئەم جۆرە لە جۆرەکانی تێکەڵ بوون ئەواروە وسێیەم جۆر دەبێتەوە کە ئەویش:-

٣- ئـەو جـۆرە کەسانەن کەتێکەڵاو بوونیـان وەکـو دەرد ونەخۆشی وایە، وەئەمەش جۆرەها پلەی هەیـە لەبـەهێزی وبـێ هـێزیدا، لەوکاتـەدا ئـەم جۆرەیـان روودەدات کەتێکەڵاوی جۆرە کەسانێك بێن کەهیچ (مصلحة)تێکی دونیاو قیامەتیان لێ وەدی ناکرێت.

٤- ئەوانەی کەتێکەڵاوبوونیان وەکـو لـەناو چـوون (هەلاك) وژەهر خواردن وایە، کەئەمەشیان زۆرینـەی هـەرە زۆری خـەڵك دەگرێــەوە ﴿لاكـثَرَهُمُ اللـــه﴾، ئەمانـەش ئـەهلی بیدعـە وسـەر لێشێواو رێگرانـی ئاینی خوان وبانگەوازی بۆپێچەوانەی ئیسلامەتی دەکەن، ئەوانـەی کـە ﴿يصـدون عـن سـبيل اللــه ويبغونهـا عوجـا﴾ وە سـوننەت دەکـەن بەبیدعـە وبیدعـەش دەکـەن بەسـوننەت وەچاکـە وخراپـەش بەهەمان شێوە، وەتێکەڵ بوونی ئەم جۆرە کەسانە یـا ئـەوەتا دڵ ئـەمرێنی وەیـا تووشـی نەخۆشـی ئـەکات، بۆیـە دەبینـین جارێکیـان کـە (طــاووس) دانیشتبو لەگـەڵ کورەکـەی یـەکێك لـە (المعتزلـة) هات ودەربارەی شتێك قسـەی کرد (طـاووس)یش پەنجەی خستە ناو گوێی تاکو هیچی گوێ لێ نـەبێ وەفــەرمانی بەکورەکـەی کـرد کەئــەویش وابکـات وەچەند جارێك فەرمانەکەی دووبارەکردەوە تـاوای کرد کە پیاوەکە بێزار بوو رۆیشت. صـالح العزی دەفەرمووێ ودەڵێت: جارێکیـان لـەلای (محمد ابـن سيرين) بـووم پیاوێ: هاتـەلای وباسـی دەرگایـەك لـەدەرگاکانی (القضــاء والقــدر )ی کـردەوە وزۆر قسەی کرد دەربارەی بۆیە (ابن سيرين) هاتە وەلأم ووتی یان تۆدەبێ لێرە هەڵستی وبرۆی یان ئێمە هەڵدەستین.

وەلەکۆتایی دا شاعیر دەفەرمووێ:-

جلوسُ المرء وحدهَ خيرٌ

مِن جلِيسِ السوءِ عِندَهُ

وجليسٌ الصدقِ عِندَهُ خيرٌ

من جلوس المرءِ وَحدَهُ.



# گرنگی ئاو لەژیاندا

ئامادەکردنی: ئارام علی
کۆلێژی ئاداب

دەستە بەرکردنی بری پێویست لەئاودا، پەیوەستە بەمەسەلەی ژیان، یاخود مردن، نەك تەنها سەبارەت بە ئادەمیزاد، بەڵکو بۆ هەموو جۆرە رووەکێك وگیانلەبەرێك، لەئەمیباوە بگرە -کەبچوکترین وسادەترین زیندەوەرە- تاوەکو دەگاتە گەورەترین وئالۆزترینی وەکو دارو درختەکان.

لێرەدا هەندێ لەزیندەوەرانی سادە هەن ودەتوانن بەبێ هەوا بژین، بەڵام هەرگیز ناتوانن بەبێ ئاو بژین. مرۆڤ گیانی لەدەست دەدا، ئەگەر بێت و لەشی زیاتر لە ١٢٪ی شلەمەنی لەدەست بدا. دەربارەی گرنگی ئاو لەژیاندا خوای باڵادەست لەچەند وشەیەکی کەم وگشتگیر وپڕواتادا کۆی کردۆتەوە، کەدەفەرمووێ: ﴿وجعلنا من الماء كل شيء حي﴾.

وشەی ﴿جعلنا﴾ لێرەدا هەم مانای خەڵق وهەم تەکوینەکە دەگرێتەوە، ئاو نوێنەرایەتی پێکهێنەری سەرەکی شلەکانی ژیان دەکات، کەئەویش بریتییە لەترشیاتی نەوەوی (DNA)ی وترشیاتی ئەمینی (الامینیە)، کەوا خانەکانی لەشی هەموو گیانلەبەرێك بەڵکو هەموو زیندەوەرێکی لێ پێك هاتووە. کەوابوو ئاو بەژداری پرۆسەی دروست کردنی زیندە خانەکان دەکات. دواتریش دەبینین کەچۆن ئاو بەژداری لە پێکهاتنی تەنەکان وبەرەوبومی زیندەوەرەکان دەکات، هەروەها هەڵدەستێ بەچالاکی زیندەگی تریش.

ئاو چەند پێویستییەکی تریش بەژیان دەبەخشێ، لەوانە وەکو دووەم ئۆکسیدی کاربۆن وئۆکسجین وخوێیەکانی ناو بەشە جۆر بەجۆرەکانی زیندەوەران.

هەروەها ئاو زۆر پێویستە بۆ سووری خوێن ورزگاربوونی لەش لەپاشەرۆکانی وهاوسەنگ راگرتنی پلەی گەرمی لەش ورێگرتن لەزێدە گەرمی خانەکانی. دیسانەوە ئاو پێویست وگرنگە بۆ هەستە دەمارەکان وجولەی ماسولکەکانی لەشی ئادەمیزاد وگیانەوەران. هەروەها بری رێژەی ئەو ئاوەی کەلەناو لەشی مرۆڤێکی مام ناوەندی داهەیە یەکسانە بە ٦٥٪ی کێشەکەی، وخوێی مرۆڤیش ٨٣٪ی لەئاو پێك دێ، هەروەها گورچیلەکان زیاد لەهەموو ئەندامەکانی تری لەش ئاو دەگرنە خۆیان کە ٨٢٪ی لەئاو پێك دێ، هەروەها مۆخیش سێیەکی کێشەکەی لەئاو پێك دێ، ئێسقانەکانیش رێژەی ئاو تیایاندا دەگاتە ٥/١، بەڵام هەرچی ددانەکانە کە پتەوترینی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤە ٢٪ی لەئاو پێك دێ.

مرۆڤ دەتوانێ دوومانگ بێ خوراك بژی، بەڵام کەمتر لەهەفتەیەك بێ ئاو دەمرێ، هەروەها بەشی هەرە گەورەی ئاوی ناو لەش بەبەردەوام تیایدا سوڕ دەخوات، بەڵام لەش رۆژانە لەنزیکەی (٢) دوو لتر ئاو رزگاری دەبێ، ئەمەش ئەو برەیە کە لەش بۆ قەرە بۆ کردنەوەی پێویستی پێیەتی، لەوانەیە گرنگترین چالاکی، کەوا ئاو پێی هەڵدەستێ لەناو لەش دا، لەنێو خودی گورچیلەکان بێ، لەبەر ئەوەی گورچیلەکان هەڵدەستن بەکاری پاڵاوتە کردنی خوێن لەپاشەرۆکان، خوێی مرۆڤیش لەکات ژمێرێك دا (١٥) پازدە جار بەناو گورچیلەکاندا گوزەر دەکات بۆ پاڵاوتەبوونی، واتە: هەردوو گورچیلە هەڵدەستن بەشۆردنەوەی نزیکەی (٩٠٠) لتر خوێن لەرۆژێك دا وبەمەش نزیکەی (٢) دوولتر پاشە رۆی میز بەرهەم دێ.

هەروەها گرنگی ئاو بۆ گیانەوەران، لەگرنگیەکەی بۆ مرۆڤ کەمتر نییە، رێژەی ئاو لەپێکهاتنی لەشی گیانەوەراندا لە پۆلێکەوە بۆ پۆلێکی تر دەگۆڕێت، بۆ نموونە رێژەی ئاو لە ناو لەشی لالەی دەریا (قندیل البحر) دەگاتە ٩٥٪، ئەمەشیان بەرزترین رێژەیە لەنێو گیانەوەراندا، لەناو لەشی قاڵونچەش دا دەگاتە ٤٨٪، ئەمەشیان نزمترین رێژەیە، رێژەی ئاو لەنێو لەشی باقی گیانەوەرەکانی تردا دەکەوێتە نێوان ئەم دوو رێژەیە، بۆ نموونە ماسی زەنج رێژەی ئاو تیایدا، هەمان ئەو رێژەیە کە لەناو لەشی مرۆڤدا هەیە، لەمریشکیش دا دەگاتە ٧٤٪و لە بۆقیشدا دەگاتە ٧٨٪و لەکرمی زەویش دا دەگاتە ٨٠٪، وەهەروەها... .

بەلام هەرچی بەروبومی ناوکە رومکیەکانە، ریژەی ئاو تیایاندا بەپێی پێگەیشتنیان زیاد دەکات، بۆ نموونە ریژەی ئاو لەناو تۆکانی سێودا دەگاتە ١٠٪، بەلام ئەم ریژەیە لەنێو سێوی پێگەیشتوو میوەی (ئەناناس)و تەماتەی پێگەیشتوو بۆ زیاتر لە ٨٠٪ زیاد دەکات، هەریەکە لەوانە بەتێر ئاو دادەنرێن، بەوەی کەریژەی ئاو لەناو تەماتەدا دەگاتە ٩٥٪و لە (ئەناناس)دا دەگاتە ٨٧٪و لەناو دەنکەکانی گەنمەشامیش دا دەگاتە ٧٠٪، ئەم ریژەیەش بەرزترە لە ریژەی ئەو دڕانەی کە ئەم دەنکانەی لەخۆ هەڵگرتوە، ئەو میوەیەی کەوا ژمارەی پێوانەیی دەرهێناوە لەخۆگرتنی ریژەی ئاو، کاڵەکە، بەوەی کەکاڵەکێکی تازە پێگەیشتوو ئەوەندەی ئاو لەخۆ دەگرێ کەوا بەشی ئەوە بکات تێنوێتی بشکێنی لەرۆژێکی گەرمی هاوین دا کە ٩٧٪ە.

بەم چەشنە گرنگی ئاو بەدی دەکەین لەدروست کردنی زیندەخانەکان وپێکهاتنی لەشی زیندەوەرەکان، ئەوەندەی توێژیمانەوە وپشکنیمان هیچ زیندەوەرێك، یاخود هیچ خانەیەکی زیندوو، هەتا

هەر شتێکی کەوا بەژیان وەسپ دەکرێ، بەرچاومان نەکەوت کەئاو بەژداری لەپێکهاتنی دا نەکردبێ: هەموو ئەوانەش بەپێی ویستی خوای زانا ودانا وکار لەجێ نەخشەی بۆ دارێژراوە وبەئەنجام گەێنراوە، بەوەی کەئەو سیفەتەی بەئاو بەخشیوە ووای لێکردوە کە لە پێکهاتنی هەموو شتێکی زیندوو بەژدار بێ، تا وای لێهات ئاو ببێتە نیشانەی ژیان، بەنەمانی ئاو هەموو رواڵەتێکی ژیان نامێنی وهەموو شتەکان وشك دەبن وژیانیان تێدا نامێنێ،هەر کاتێکیش ئەو ئاوە بەدی کرا، ئەوا هەموو رواڵەتەکانی ژیان بەدیاردەکەون ودەست بەبوژانەوە دەکەن وسیماکانی شارستانیەت گەش ونما دەکات. ﴿وترى الارض هامدة، فإذا أنزلنا عليها الماء اهتزت وربت وانبتت من كل زوج بهيج ذلك بإن الله هو الحق وإنه يحيي الموتى وأنه على كل شيء قدير وأن الساعة آتية لاريب فيها وأن الله يبعث من في القبور﴾ الحج (٥-٧).

پەراوێز:-

١- ئەمیبا: زیندەوەرێکی یەك خانەییە، لەنێو گڵ وقوڕ وئاودا بەدی دەکرێت، خوراکی لەسەر رووەکەکان وزیندەوەرە یەك خانەییەکانە.

٢- ترشی ئەمینی Amino Achds: پێکهاتوی سەرەکی پرۆتینەکانە، لەئەنجامی کرداری هەرسکردندا لەکاتی دابەش کردنی پرۆتینەکان بەرهەم دێ، لەدوایی دا ئەم ترشیە جارێکی تر لە نێو خانەکانی لەش دەگۆڕێ بۆ پرۆتینەکان. ئەم ماددەیە لەگۆشت وهێلکە وشیردا بەدی دەکرێت.

٣- ترشیتی نەوەوی (الحامض النووي)- ئاوێتەیەکی ترشەلۆکیە لەسەرجەم زیندە خانەکاندا بەدی دەکرێ، لەکاربۆن وهایدرۆجین وئۆکسجین ونایترۆجین وفۆسفۆر پێك دێ.






١-جنس:

جنس غەریزەیەکی سروشتی مرۆڤە وەك هەر غەریزەیەکی تر لەلاشەیدا، سنوری تایبەتی خۆی هەیە بەجوانترین شێوە وپاکترین رێگابەکاردێت، ئیسلام ئەم غەریزەیە سنوردار دەکات وبەئاواتی مرۆڤ دانانێت بەڵکو بە وسیلەیەکی جێبەجێ کردنی کاری مرۆڤی دادەنرێت، ئەویش ئاوەدان کردنەوەی زەویە، یان رێگایەکە بۆ پاراستنی نەوەی مرۆڤ، ئیسلام ئەم غەریزەیە چارەسەر دەکات بەژن هێنان یان خۆگرتن وبەرۆژی بوون، خودای کار بەجێ دەفەرمووێ ﴿وليستعفف الذين لايجدون نكاحا حتى يغنيهم الله من فضله﴾ النور (٣٣).

هیچ کاتێك لەئیسلام ئەم غەریزەیە کێشەیەك نەبووە وپروپاگەندەی بۆ بکرێت بۆ چارەسەری، چونکە ئیسلام هەڵچونی ئەم غەریزەیە رێك دەخات، تاك واپەردەوەردە دەکات کە چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکات، بۆ نموونە دەبێ منداڵەکان لەپاش دەساڵ جێگاکانیان جیاواز بکرێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (مروا اولادكم بالصلاة لسبع

واضربوهم لِعشرٍ وفرقوا بينهم في المضاجع). یان نایەڵێت ئافرەت لاشەی خۆی دیاریخات وبۆنی خۆش لەخۆی بدات ولەشەقامەکان بسوڕێتەوە، بەڵام دەمێکە ئەم زاراوەیە بانگەشەی فراوانی بۆ دەکرێت وهەوڵ دراوە لەقەبارەی خۆی فراوانتر نیشان بدرێت وشانۆ وسینەما ورۆژنامە... گشتیان خۆیان پێوە خەریك کردوە، ئەمەش گواستنەوەی بیرێکی رۆژئاوایە بۆ نێو کۆمەڵگەی ئیسلام بەتایبەت ورۆژهەڵات بەگشتی، ئەم زاراوەیە رۆژێك لەرۆژان کێشەیەکی هەبووە لەرۆژئاوا، کاتێك ئاینی مسیحی (النصاری) گۆڕدرا ئەم کێشەیەش وەك کێشەکانی تر هاتە میدان، وانیشان درابوو ئاین بریتیە لەگۆشەگیری نێو کلێسا ورازی بوون بەژیانێکی روحانی ووشك دوور لەلاشەو غەریزەی جنسی[1]، ئافرەتیش سەرچاوەی گوناهی باوکە ئادەمە، دەبێت خۆی لێ دوور بگرێت چونکە رۆژێك هاوپەیمانەتی لەگەڵ شەیتان بەستووە. لەبەر ئەم هەلانەی کلێسا لەرۆژئاوا بەتەواوی بانگێشی ئازادی جنسیکرا، وبوبە ئاواتی هەرگەورەی مرۆڤ، (فرۆید)یش هات ئالای بەرەلای جنسی بەرزکردەوە لەدژی مت بوونی جنس (كبت الجنسي) لەلایەن کلێسا.






## ٢- وجودیه ت

ئەم زاراوەیە لە پاش شەڕی دووەمی جیهانی وەلە فەلسەفەیەکی نوێ سەری هەڵ دا پاش ئەوەی شەڕی جیهانی دووەم کارەساتی خۆی بەسەر ئەوروپا هێنا ملیونەها مرۆڤی تیادا کوژراو مالێك لە ئەوروپا نەما کوژراوێك یان بریندارێك ئەبەخشێتە ئەم شەڕە. بۆیە مرۆڤی ئەوروپی پەنایی بردە بەر ئەم رێبازە پاش ئەوەی هەموو دەرگایەکی لێ داخراو. بەلکو ببێتە دەرمانی دەردەکانی وجارێکی تر تووشی شەر وکاول کاری نەبێت، وچونکە مرۆڤی ئەوروپی ئەوەی لێی دەترسێت تەنها مردنە، بۆیە دەبێ لە مردن رابکەیت وەك ئەوەی لە ناو ئەو رێبازەدا هەیە. (تاك) سەرچاوەی هەموو شتێکە دەبێ بوونی خۆی بسەلمێنێت، خۆی پابەند نەکات بەهیچ خوورەوشتێك ویاسایەك ودینێك یان هەر رێسایەکی پیرۆز. تاك لە سەرووی کۆمەڵە. نابێت هیچ پالەپەستۆیەك بخرێتە سەر تاك، بۆیە ئەم بیرانە رەواجیان بۆ پەیدا بوو هەموو خەلك رووی تێکرد بەتایبەت لە فەرنسا لەسەر دەستی سارتەرو سیمون چەند کەسی تری بیری ماددی واتە ئەم رێبازەش هەر سەرچاوەکەی ماددیە وبەس ئەگەر چی هەلگرانی دابەشی دەکەن بەسەر بیرێکی مادی وەبیرێکی مسالی بەلام لە راستیدا بیری وجودی میسالیش هەر دان بەبوونی خوا وپاداشت وبەهەشت نانێت. بەلام سووپاس بۆ خوا ئەم رێبازە لە نێو کۆمەلگەی ئیسلامی رەواجێکی وای بۆ پەیدا نەبوو دوژمنانی ئیسلام شانازای پێ بکەن ئەوەش لەبەر ئەوەی ئیسلام وەك بەرگرێك ومناعەیەك، لە بەردەم ئەم بیرە پڕ نەخۆشیە وەستا. واتە نەخۆش (وجود) کە بریتیە لە بێ ئومێدی ودلەڕاوکێی ونامەعقول وبێ مەبست بوونی ژیان. وەئیسلام تاکەکان وا پەروەردە دەکات کە نابێ مرۆڤ بێ ئومێد بێت لە ژیان دەبێ هەول بدات بەگوێرەی هەوڵ دانیش پاداشت وەردەگرێتەوە ﴿وأن ليس للانسان الا ما سعى، وأن سعيهُ سوف يرى﴾ النجم (٣٩،٤٠). وەمردنیش تەنها بۆ مرۆڤی بێ باوەڕ کارەساتە. بەلام بۆ مرۆڤی باوەڕ دار سەرکەوتنە گەر بۆ خوا بێت یان لە سەر رێبازی خوای گەورە بێت ﴿قل هل تربصون بنا الا احدى الحسنين﴾



[1] پاشماوەی ئەم دیاردەیان ئێستاش ماوە کاتێك دەبینین قەشەکانیان ژن ناهێنن، ومراهیبەکانیشیان مێرد ناکەن.

## "ترسناكترين لادان لەچەمكی لا اله الا الله"

نووسینی: یوسف عبدالله

پەیمانگای تەكنیكی

لای هەموو كەسێك ئاشكرایە، كەچەمكی لا اله الا الله لەئیسلام چ بایەخێكی گرنگی هەیە. یەكەم كۆلەگەی ئیسلامە وهەر كەسێك بیڵێت ئەوا لەبازنەی كوفر دێتە دەرەوە وەدەكەوێتە نێو بازنەی ئیمان، مال وخوێن وناموسی لەسەر موسڵمانان حەرام دەبێت تەنها بەمافی خۆی نەبێت. بەڵێ (لا الـه الا اللـه) ئەو پەیمانەیە كەمرۆڤ لەگەڵ خوای گەورە دەیبەستێت رۆژی دوایی دەبێتە شەفاعەت كاری، وەك ئیبن عباس لەتەفسیری ئایەتی ﴿لایملكون الشفاعة إلا من اتخذ عند الرحمان عهداً﴾ مریم (٨٧)، دەفەرموێت ﴿عهداً﴾ واتە ووشەی یەكتاپەرستی (لا اله الا الله)، بەڵام زۆر كەس واتی گەیشتووە كە تەنها ووتنی (لا الـه الا الله) بەسە بۆ خوا لەخۆرازی كردن، رزگاری بوونی پێیە لەدۆزەخ وكلیلی بەهەشتیش تەنها ووتنی ئەم چەند ووشەیە، چەند فەرموودەیەكیش دەكەنە بەڵگەیی ئەو بۆ چوونانە وەك ئەوەی كەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ان الله حرم علی النار من قال لا اله الا الله یبتغي بذلك وجه الله)متفق علیه.

بەڵێ ئەمە ترسناكترین لادانە كەبەسەر ئەم چەمكە پیرۆزەدا هاتووە، بەدرێژایی مێژووی ئیسلامیش كەسانێك خۆیان لەفەرمانەكانی ئیسلام دزیووەتەوە، هەر بەبیانووی ئەوەی كەموسڵمانن چونكە دەڵێن (لا الـه الا اللـه). وەك چـۆن (مرجئـة) رۆژێـك لـەرۆژان نوێنەرایەتی ئەم بۆچۆنەی دەكـردو، ئەمرۆكەش عەلمانیەكان بەهەمان شێوە، بانگەشەی ئەوە دەكەن كەتەنها بۆ خۆت لەماڵەوە هەر بڵێ (لا الـه الا اللـه) ئەو كات دەچیتە بەهەشت هیچ پێویست ناكات تۆ خۆت لەگەڵ سیاسەت وبازار وژیانی كۆمەڵایەتی ماندووبكەیت. بەڵام ئێمە گەر بێت وهەر سەر پێ تەماشایی قورئان وفەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ بكەین دەردەكەوێت ئەوانەی وا دەڵێن چەند گومرابوونە وهیچ لەدین نازانن بۆ نموونە:-

هەموو قورئان تەماشا بكەین كاتێك باسی ئیمان دەكات یەكسەر ووشەی كار وكردەوەی چاكی لەگەڵ دا دێت، واتە ئیمان وكار وكردەوەی چاك دوو رووی‌یەك راستین وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿الا الذین آمنوا وعملوا الصالحات﴾ العصر(٣). یان ﴿ومن یؤمن باللـه ویعمل صالحاً یكفر عنه سیئاته﴾ التغابن (٩).

یـان کـاتێك دەروانیتـە قورئـان باسـی ئەوكەسانە دەكات كە لەرۆژی دوایدا دەچنە بەهەشـتەوە. لەپاداشـتی کـار وکـردەوە چاكەكان دەرۆنە بەهەشت. نەك لەبەر ئـەوەی بەزمان (لا الە الا اللە) یان بڕیار داوە.
وەك ئـەوەی خوایـی گـەورە دەفـەرمووێت ﴿ولكل درجات مما عملوا وليوفيهم اعمالهم وهم لا يظلمون﴾ احقاف(١٩).
وەكاتێكیش خودای كـار لـەجێ باسـی دوو ڕوكـان دەكـات، دیـارە ئـەوان ئازاریـان زۆر لـەكافران زیـاتر ونـاخۆش تـرە وەك دەفەرمووێت ﴿ ان المنافقين في الدرك الاسفل من النار ولن تجد لهم نصيراً﴾ النساء (١٤٥)هەمووشمان دەزانین كەمرۆڤی منافق نوێژیـش دەكـات ولەگـەڵ كۆمـەڵی موسڵمانیش ژیان دەباتە سەر هەر بۆیە -ابن تيمية- دەفەرمووێت: مەبەست لەووتنی لا الـه الا اللـه تـەنها گوتـن نیـە بـەزمان دەبـێ بـەئاگابێت لەمانایەكـەی وە بـەگوێرەی پێویستیەكانی (لا الـه الا اللـه) كـار بكـەیت. چونكە دووڕووەكان گشتیان -لا الە الا اللـه- دەڵێن لەگەل ئەوەیش لـەژێرەوەی كافرانیش دان.
هـەروەها لەئیسـلامدا ئـەم چەمكـە بەچـەند مـەرجێك بەسـتراوەتەوە دەبـێ هـەموو مرۆڤێكی مووسڵمان خۆیـانی لێ شـارەزا بكات ئەو كات جێبەجێیان بكات ئنجا -لا الە الا اللە- تەواو تێ دەگات ودەبێتـە ڕزگار كاری لەرۆژی دوایدا وەك ئـەوەی لـە- وهـب كوڕی منبه- یان پرسی ئایا -لا الە الا اللـە-
كلیلـی بەهەشـت نیـە ئـەویش لـەوەلآمدا فـەرمووی بەڵی بەلآم هـەموو كلیلێك ددانـی خـۆی هەیـە بـۆ كردنـەوەی دەرگاكـان، وەددانـەكانی كلیلـی بەهەشـتیش بریتـین لەزانسـت ونـەبوونی گومـان وقبـوڵ كردنـی هەموو فەرمانەكانی خوای گەورە وەملّ كەچ بـوون وبەراسـت زانـین وخۆشەویسـتی وەبەدلسۆزی كاری بۆ بكەیت.
لـەكۆتایی دەڵێـن مووسـڵمانی ڕاسـتەقینە ئـەوكات سـەركەوت وسـەربەرزی هـەر دوو دوونیـا دەبێـت گـەربێت هـەموو كـار وكردەوەكانی بەگوێرەی -لا الە الا اللە- بێت، وەك خوایـی گـەورە دەفـەرمووێت ﴿قـل ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين، لا شريك لـه وبذلك أُمرت وانـا اول المسلمين﴾ انعام (١٦١ - ١٦٢).
ئـەگینا سـوودی بـۆ خاوەنـەكی نـابێت وەكافرەكانیش چاك دەیانزانی كەووتنی -لا الـە الا اللـە- چیـان لەسـەر پێویست دەكـات دەبێبە تـەواوی مڵ كەچی بـن وواز لـە لات وعوزا وهوبڵ بهێنن بۆیە ئەم چەند ووشەیان بڕیار نەئەدا.

## ئـاگـاداری

ئاگاداری خوێنـەرانی هـاوێر دەكەینـەوە كـە ئـەم ژمارەیـە دەبێتـە كۆتـایی ئـەم سـاڵمان (١٤١٧هـ - ١٩٩٧م) بەهیوای سەركەوتنێن بۆ كشت قوتابیـانی موسـڵمان وهیـوای پشـوویەكی پـڕ بەختـەوەری وسوود بەخشین بۆگشت لایەك.





## ژوان

شیعری: ڕێبین عبدا لله
کۆلیژی: ئاداب

(موسڵمان)ێ
له پاش سەرنج و (ڕامان )ێ
له ماناو مەینی (مان)ێ
له ئاست ئاَدانی (ئاَمیان)ێ [1]
بۆ پەیژەی پڕ شنگی (پەڕ) و
پەروازی بێ پەرِوای(زمان)ێ [2]
به (پێکان)ی [3]
هاته دوانێ:
((پێنووسەکەم))
ڕاڤەی ڕازو(ڕێ نووسەکەم)
خۆشم دەوێ‌ێ
بەقەد بەرزی و سەختی(چیا)
بەقەد دڵ و پەڕەی گوڵ و
چریکەی بولبول و (گیا)
بەقەد (ژان)ی ئەو(گیانە)ی
بۆ (ژین)مردو بۆ(ژین)ژیا [4]
بەقەد ئەو مۆمە (نامۆ)یەی

---

[1] ئادان: بەپیت، ئامیان: هەوێن

[2] پەرواز: فڕین، بێ پەروا: نەترس

[3] پێکان: لەنیشانەدان

٤ مەبەست لەژینی یەکجاریەیە واتە بەهەشت

ئەو(دیاری) و (دیدارە) دیارەی
بۆ پەنمانی[1] پەشۆ کاوان
پەرژان و پووکانەوەیە
بەقەد باڕووتی ئەو بۆمبەی
هەتا ئێستا
له ڕووی یاساغی (یاسق) و
(دیموکراسیەت) و (ئاَڤێستا)
بورکان و نرکانەوەیە
ڕابوون وبوژانەوەیە

* * *

((پێنوسەکەم))
ڕاڤەی ڕازو(ڕێ نووسەکەم)
خۆشم دەوێ ی
لەو ڕۆژەوە بۆ (ژین) دەژیم،
بۆیە دەڵێم:له من مەپرسەو مەترسە
دڵنیابە لەوانە نیم
قسەی لووس ونووکی پێنووس
بکەم بەپەیژە بۆ بەرزی
بۆدەنگی چەپڵە وئافەرین
بۆ پڕ کردنی کاسە خوێن
بۆ ژینگەی (وەرزی پڕ هەرزی)
بۆ (جووتی) و (ڕووتی) و
(ڤیز ە)ی ڕووس
بۆ کۆشکی مەڕمەڕینی لووس

* * *

(( پێنوسەکەم))
ڕاڤەی ڕازو (ڕێ نووسەکەم)
نەخێر .. نەخێر
وەك خەڵکانی
کاڵفام وتێر

---

[1] پەنمان : ئاوسان

چەقەڵی خۆ کردوو بەشێر
لووت بڵند ولەخۆبایی
ناتدەم بە(پێك) فرکەری (بار)
هەڵت دەگرم بۆ تەنیایی
ناتکەم بەسەر چۆپی شایی
نەخێر .. نەخێر
منی لانەوازە وهەژار
ناتکەم بەمێزی ژێر قومار
ناتدەم بە (فرانك) و (دۆلار)
لەولاتی بێ بروایی و
بێ نەوایی وبەرەڵایی
- دۆزەخی هەتا هەتایی -
* * *
((پێنووسەکەم))
راڤەی رازو (رێ نووسەکەم)
ژوار وژیلەمۆی دەماغ و
سۆمای‌تەکان وتینەکەم
بەڵێن وژوان لەژینەکەم:
وشەکانت بۆ دینەکەم
بکەم بەشریقە دەنگێ
بەفیشەکی نێو تفەنگێ
بەپێشەوایێ، پێشەنگێ
بۆ گشت مژدە و(شادەمەرگێ)

* * *
هۆ .. نووسەران
هەتا کەنگێ؟
شەیدایی بۆ وشەی نەرم
لەوێنەی پێخەفی گەرم
شیرین وەك شیلاوی هەنگێ
وەك ونازی شۆخ وشەنگێ
هەتا کەنگێ؟
ئێمەی تەرم ناکەین شەرم!!
* * *
هۆ ... نووسەران
شاهێن ورێبەری سەران
هەتا کەنگێ؟
لەهەندەران
وشەبکەین بەنان وقووت
هەتا کەنگێ.
وشە نەکەین بەزەقنەمووت،
بەکەڵبەی بەخرێنی (حوت)ێ
بەرێختی[1] رێژنەی (طالوت)ێ
بەدارە مەیتی (تابووت)ێ
بە (تا)و (تاوێر)[2]ێکی بە (تاو)
بۆ (تاودان)و (خوێن خەڵتان)ی
کەلـە ولاشەی گشت (طاغوت)ێ.

❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖❖

(1) رێخت : سروشت
(2) تاوێر : گاشە بەرد

بسم الله الرحمن الرحيم

{ إذا جآء نصرُ الله والفتح، ورأيت النّاس يدخلون في دينِ اللهِ أفواجاً، فَسَبِّح بِحمدِ رِبّك واستَغفِرهُ إنهُ كان تّواباً} النصر

**إنتصار المسلم الذي يهفوا إليه وَيشكر الله عليه ليسَ غَلبةُ جيش. إنّهُ النّصر تحت راية العقيدة دونَ سائر الرايات. والجِهاد لنصرة دين اللهِ وَشريعتهِ لا لأي هدفٍ، والذيادُ عن {دار الإسلام} بشروطها تلك لا أيّة دار، والتَجرّد بعدَ هذا كُلهُ لِله، لا لِمَغنم وَلا لِسُمعة، وَلاحميّة لأرضٍ أو قَوم، أو ذود عن أهل وَ ولَد، إلاّ لِحمايتهم مِن الفتنة عن دين الله: {عن أبي موسى رضي الله عنه قال: - سُئِلَ رسول الله صلى الله عليه وسلم - عن الرَّجُل يَقاتَلُ شجاعةً ويقاتل حميّةً ويقاتِلُ ريآءً، أي ذلكِ في سبيل الله؟ فقال: - {مَن قاتَل لِتكون كلمة اللهِ هي العُليا فَهو في سبيل الله} .. وفي هذا وحدهُ تكون الشهادة لا في أيِّ حربٍ لأي هدفٍ غير الهدفِ الواحد .. لِله..}**

**سيد قطب**